

# پەنجەرەی ناز

## لە بارەی ئەدەبیات و عیرفانی کوردییەوە

سازدان و گفتوگۆ
موسعەب ئەدهەم

گوڵشەن

# په نجه‌ره‌ی ناز

له باره‌ی ئه‌ده‌بیات و عیرفانی کوردییه‌وه

سازدان و گفتوگۆ

موسعه‌ب ئه‌دهه‌م

**له بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی گوڵـشەن**
**زنجیرە (٥) ساڵی (٢٠٢١)**

گوڵشەن

- **ناوی کتێب:** پەنجەرەی ناز
- **بابەت:** گفتوگۆی ئەدەبی
- **سازدان و گفتوگۆ:** موسعەب ئەدهەم
- **بەرگ:** ڕەوشت محمد
- **دیزاینی ناوەوە:** شکار جەلال
- **چاپخانە:** گوڵشەن
- **نۆبەی چاپ:** یەکەم - ٢٠٢١
- **نرخ:** ٣٥٠٠ دینار
- **تیراژ:** ٥٠٠ دانە

له بەڕێوبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٢٠٠٩) ی ساڵی (٢٠٢١)ی پێدراوە

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

**بجۆشۆ هەر کەس وە قەد ناڵەی وێش**

**بنۆشۆ هەر کەس وە پیاڵەی وێش**

مەولەوی تاوگۆزی

چەند ساڵێك پێش ئێستا لە دیدارێکی دۆستانە و کەشێکی پڕ لە جوانی و دوور لە ژاوەژاوی تەکنۆلۆژیادا، ئەو پرسیارەم لە مامۆستا و شاعیر و زمانزان (م. جەمال بێدار) کرد، شتێکی لەمجۆرە هەیە لەمەڕ ئەوەی کە پرسیاریان لە بلیمەت و عەللامەی کورد (مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس) کردووە، بەوەی چۆن تاقەتتان هەبووە هێندە بژین؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرموویەتی: بە ئەدەبیات ژیاوم! مامۆستا (بێدار) کە خۆی لەوێ ئامادەیی هەبووە، جارێکی دی ئەم باسەی بۆ گێڕامەوە کە بەڵێ مامۆستا ئەو وەڵامەی داوەتەوە.

پیاوێك بەو گەورەییە کە شارەزای باخی بەرزە دەماخی ئەدەبیات و شیعر و عیرفانی کوردیمانە، گەر هەوڵ و شەونوخوونی و ماندووبوونەکانی ئەوان نەبوایە، وێنای ئەوە ناکرێ ئێمە خاوەنی چ شتانێك دەبووین لە فەرهەنگ و ئەو ئەدەبیاتە ناسك و پڕ حیکمەت و جوانییەی شاعیران و

عاریفانمـان. بۆیـە ئـەدەبیات ڕۆحـی مـەزنی ئەویشـیان بـە زیندوویـەتی هێشتۆتەوە.

لە چەند گوڵە وشەیەکی کورتدا دەتوانین بڵێین ئەدەبیات و بە تایبەت ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردی ئێمە، ڕۆحی فەرهەنگ و کولتوور و حیکمـەت و دونیای ڕاستەقینەمانە. ئێمەی نەتەوەی کورد لە ڕابـردوودا و وردتـر لـە سەردەمی شاعیرە مەزنەکانماندا، هەگبەمان چ شتێکی تێدا بـووە؟ چـەند کتێبی زانستی و چەند ڕۆمان و چەند کتێبی فەلسەفیمان هەبووە؟ شـیعر لە ڕابردووی ئێمەی کورددا ڕووناککـەرەوەی ڕێگـای ژیـانی کوردەواریمـان بووە، بێگومان هیچ نەتەوەیەك بە بێ فەرهەنگ و پاشخانێکی ڕۆشـنبیری دەوڵەمەنـد و بەرهەمـدار نـەك بـە زینـدوویی نامێنێتـەوە، بـەڵکو نـاو و ناونیشانی ون دەبێت و دەسڕێتەوە. نەتەوەی کورد چ شتێکی هەیە جگە لـە شـیعر کـە وا بکـات خـەرمانی فەرهـەنگی و ڕۆشـنبیری و کـەلتووری ڕابـــردووی جێگـــەی شـــانازی نـــەوەکانی بێـــت! بـــە تایبـــەت ئێمـــەی نیشـتەجێبوانی دونیـای نـوێ و دونیـای تـەکنۆلۆجیا و شاشـەکان. شـیعر داچـۆڕاوی حیکمـەتی حـەکیمان و نیگـای جـوان و جـوانبینی عاریفـان و شـاعیرانمانە لـە دونیـای ڕابـردوودا کـە بـە زینـدوویی و جـوانی و ناسـکی خۆیەوە بۆمان ماوەتەوە و هەمووان لەسەر سفرەی ڕازاوەی وشە و بەیتە

پڕ لە دانایی و جوانەکانیانەوە کەیل دەبین بەو جوانی و حیکمەتەیان و لەئاوی زوڵاڵی دەریای پڕ گەوهەری ئەوان نۆش دەکەین.

ئەم کتێبەی بەردەستت کۆبوونەوە و گوتوبێژە لەگەڵ چەند مامۆستا و نووسەر و خاوەن بۆچوون و لێکۆڵەرێك لەم بوارەدا و، قسەکردنە لەمەڕ ئەو سفرە و خوانە ڕۆحی و کلتووری و فەرهەنگییەی شاعیرانمان بۆیان ڕاخستووین، ئیدی بە هەر هۆکارێك بێت وەکو پێویست ئاوڕی جیدی و گرنگمان لێ نەداوەتەوە، هەروەك چۆن وڵاتان و بە تایبەت گەلانی دراوسێمان، زۆر بە گرنگی و پەرۆشییەوە ئاوڕیان لە فەرهەنگ و حیکمەتی پێشینانیان داوەتەوە و ساڵانە چەندین لێکۆڵینەوە و کتێب و وتار و بڵاوکراوەی تایبەتیان هەیە لەم ڕووەوە، تەنانەت ناساندنی ئەو فەرهەنگەیان کە لێرەدا زیاتر مەبەستمان شیعرە، بۆ گەلانی دونیا و وەرگێرانی دەق و ڕاڤەی بەیتەکانیان و ناساندنی جیهانە ڕەمزئامێز و ڕازئامێزەکەیان بۆ نێو دونیای دوور لە ڕاز و وشك و ڕەقی مۆدێرن.

ئەرکی سەرشانی ڕۆشنبیرانە بە گشتی و نووسەران بە تایبەت، جارێکی دیکە بچینەوە نێو ئەو فەرهەنگە دەوڵەمەندەمان کە خۆی لە شیعردا دەبینێتەوە، ئەوەی گرنگە بۆ ئێسامان و نەوەکانی داهاتوومان بیانناسێنین و کاری لەسەر بکەینەوە، بە تایبەت ئەو دیوە زیندووە ڕۆحی و مەعنەوییەی لە گەنجینەی هەریەکەیاندا بە جۆرێك بوونی هەیە.

بۆیــه پێویســـت ئــەکات جــارێکی دی ســـەرەتا ئـــەو فەرهەنگــە دەوڵەمەندەمان بناسین و بناسێنینەوە، پاشـان ورتـر و بـە پێـی پێـوەرە نوێکان و قوتابخانە فیکری، فەلسەفی، زانستی و دەروونییەکان، بچینەوە خزمەت ئەو دەقە ناسك و قوڵانە و لـە دەریـای هـزر و حیکمەتەکانیانـەوە هێندەی گۆزەی ڕۆحی خۆمان هەڵگۆزین و عاشقانە و عاقڵانـە بگەڕێنـەوە بـۆ ئـەو جیهانـەی کـە بناغـە و ڕەگ و ڕیشـەی ڕەسـەنی کـوردەواری و فەرهەنگیمانە.

گفتوگۆکان لەگەڵ کەسایەتییەکانی نێو کتێبەکە دەکرا لەوە زۆر زیاتر بن هەروەك وا بڕیار بوو، بـەڵام هـەر هێنـدە توانیمـان! بـۆ ئـەوەی لـەوە زێـدەتر ئـەم جـۆرە ڕوانینـە بـۆ جیهـانی حـەکیمان و شـاعیرانمان پێمـان باشبوو، وەکو دەستپێکێك ئـەم نووسـەر و لێکۆڵـەرە خـاوەن بۆچـوونانە بەسەر بکەینەوە و لە نیگا و ڕوانینی هەر یەکەیانەوە سەیری ئەو میراتـە مەزنە بکەین، هەروەها نووسەرانی و لێکۆڵەرانی تـریش کـە گەلـێ زۆرن، گەر خودا یاربێت بتـوانین لـە کتێبـی دیکـە و بـە گفتوگـۆی دیکـە بەسـەر بکەینـەوە، چـونکە کۆنترینیـان بـۆ زیـاتر لـە (٩) سـاڵ دەگەڕێتـەوە و نوێترینیان بۆ ساڵێك لەمەوبەر، وە پێمانباشبوو لەوە زیاتر بـە شـاراوەیی نەمێنێتەوە و کاڵای کتێبی بە باڵادا بکەین.

ڕاستییەکەی بۆ ئەوەی لە جیهانی ڕەمز و ڕازی جوان و مەعنەوی و حیکمەتمان، کە جیهانی شاعیرانمانە، شیعرەکانیان داچۆڕاوی حیکمەت و مەعنەوییەت و فەرهەنگی کوردەواریمانن، زێدەتر و باشتر تێبگەین، پێویست دەکات پێوەرەکانی مامەڵەکردنیشمان بگۆڕین بەو ئامرازانەی کە ئەو جیهانەی پێ دەخوێنرێتەوە، گەرنا بە عەقلی ئامرازی و بەرژەوەندیخوازی و عەقڵی سارد و تەکنولۆژی، نەك هەر ناتوانین بچینە نێو ئەو جیهانە بەرینەوە، بەڵکو ناتوانین پەی پێببەین و تاکو زێدەتر بڕۆین، زیاتر لێی دووردەکەوینەوە، لەو هەموو جوانی و ناسکی و داناییە بێبەش دەبین و پەی بە حەقیقەتی نەمر و نیگا جوانەش نابەین.

ناونیشانی کتێبەکەش (**پەنجەرەی نان**) دوو گوڵە وشەی نێو باخی سەوزی شاعیر و حەکیم (مەولەوی تاوگۆزی)ین و لەوەوە وەرگیراون، بۆیەش بێ داغ و غەمی عیشق، (مەحوی) گوتەنی ناتوانین لە حەقیقەتیش تی بگەین.

دڵ لە ئیدراکی حەقیقەت بێ بەشە بێ داغی عیشق

"مەحویا" دانا دەبێ بەم چاوە بینایی بکا

موسعەب ئەدهەم

٢٠٢١/١٠/١٨

سلێمانی

# ئێستاتیکای خودایی
## ئەمەیە چیرۆکی پەیوەندی نێوان بوون و هەبوو...
### گفتوگۆ لەگەڵ "ڕێبوار سیوەیلی"

**موسعەب ئەدهەم: گەر "جوانبینی" یەکێك لە تایبەتمەندی و سیفەتەکانی عاریفان بێت و ئەدەبیاتی کوردیش وەك ئاوێنەیەك کە چەندین عاریف و عاریفی شاعیری تێدا دەبینرێت و ئەمەش وا بکات ئەدەبیاتی کوردیمان ڕەنگدانەوەی ئەو جوانی و جوانبینییەی تێدا نومایان بێت، بۆچی نەوەکان و ئەدیبانمان لەم سەردەمەدا نەیانتوانیوە ئەو چێژ و جوانبینییە درێژە پێ بدەن؟ یان بە مانایەکی تر بۆ ئێمەی مرۆڤی سەردەمی نوێ بگوازنەوە؟**

ڕێبوار سیوەیلی: منیش بیرم لە ناوەڕۆکی ئەم پرسیارە کردبووەوە، ساڵانێکە خولیای ئەوەم هەبووە بگەم بە وەڵامێکی شیاو، کە شایانی خستنەڕوو بێت. لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێ زۆر خاڵ لەوەها وەڵامێکدا بخرێنە ڕوو، بەڵام من هەرگیز باسی دوا هۆکار یان هۆکاری سەرەکی ناکەم، وەڵامەکەی من لە چوارچێوەی ئەزموونی بیرکردنەوەی خۆمدایە لەو بابەتە و هیچیتر. سەرەتا تۆ پرسیار لە ئامادەیی جوانی دەکەیت لە شیعر و بەرهەمی شاعیر و عاریفاندا، چ لە نەریتی شیعری و عیرفانیی

خۆماڵی و بیانی. لەو نەریتەدا جوانیی سیفات و خەسڵەتی جەوهەریانەی بوون و خودایە، کە لە هەمان کاتیشدا کامڵ و خێر و ڕەهایە. لە ڕووی میژووییەوە، ڕەگێکی پلاتۆنی و نویٚ پلاتۆنی لەم بیرۆکەیەدا هەیە و ڕەنگدانەوەکەی لە ئەدەبیاتی عیرفانیدا و لە چوارچێوەی شیعریدا زۆر بەرجەستەیە. ئەم جوانی و جوانبینییە پەیوەستیشە بە ڕاستەقینە و حەقیقەتەوە، کە هەیە و لەناو ناچێت. بەڵام لە شیعردا بە زمانی مەجاز و میتافۆر و هونەرەکانی دیکەی شیعری کلاسیکی، ڕازێنراوەتەوە و لە ناوەڕاستی پانتاییەکی میتافیزیکیانە و جیهانەکیدا خۆی بەرجەستە دەکات. هەرچەندە ئامانجەکە میتافیزیکیانە و مەبەست لە جوانی، جوانیی ڕەهای خودا و حەقیقەتە، بەڵام شاعیر و عاریفەکان و شاعیرە عاریفەکان، بەو پەڕی کارامەیی و لێهاتووییەوە و بۆ تەرویجکردنی ئەو وێنا میتافزیکیانەیە لەسەر جوانی و چاکە و خەیری ڕەهای خودا، سوودیان لە ڕەهەندە دونیایی و ماتەریاڵییەکەی ئەزموونی مرۆیی وەرگرتووە و لە ڕێگەی بەرجەستەکردنەوەیەکی مرۆییانەی جوانییەوە، لە ئاستی فۆرمدا، ناوەڕۆکە میتافیزیکیەکەی جوانییان داڕشتۆتەوە. بەمجۆرەش خۆشەویستی ئەوان بۆ جوانیی ڕەها، هێناونییە سەر ئەو بڕوایەی کە ئەم جوانییە ڕەهایە بەهۆی وەسفکردنی جوانی ڕیژەییەوە، کە لە هەمان کاتدا جوانییەکی کاتی و مرۆییشە، بەبیری مرۆڤ بهێننەوە.

هەر لەبەر ئەمەشە کە بەردەوام شیعری کلاسیکی ئێمە پڕە لە وەسفی مەجازی بۆ بوونی ڕاستەقینەیەك، کە دەرەهەستە و دەرەفیزیکیانەیە، بەڵام شیاوی وێناکردن و باوەڕپێهێنانە. بەمجۆرەش، شاعیرانی کلاسیك لە عەشقی عیرفانیانەیانەوە بۆ خودا و بۆ بەرجەستەکردنی ئیستاتیکای خودایی، لە هەوڵێکی بەردەوامیی نزیکخستنەوەیدا بوون لە هەبووە جوانەکان و لە جوانیی ژن و مەعشووق. لە جوانیی خوداوە بۆ جوانیی ژن" ئەمەیە چیرۆکی پەیوەندیی نێوان بوون و هەبوو. ئەگەرچی ئەمکارە، لە ڕووی پرانسیپەوە، دەکەوێتە بواری گوناه و غەدرەوە لە خودا، چونکە پرۆسەکە، لە هێنانەخوارەوەی ئاستی بالاوە بووە بۆ خوارەوە، لە بەراووردکاریی پیرۆزەوەیە بە نا پیرۆز، بەڵام پاساوی ئەم گوناهەیان بە عەشقی خۆیان بۆ خودا و لەسەر بنەمای زمانێکی میتافۆریانەوە، داوەتەوە و پینەوپەرۆیان کردووە، ئەمە جگە لەوەی ئامانجەکەشیان بریتیبووە لە بەرزکردنەوەی ئاستی جوانیناسانە و چێژی باوەڕداری خەڵك بە گشتی و ناساندنی جوانی و چاکە و کەماڵی خودا، بە مرۆڤ..

ئەم پەیوەندیە کە شاعیری عیرفانی بە هێزێکی میتافیزیکییەوە بەستۆتەوە، لە ئێستادا پچڕاوە و نەماوە و شاعیری ئێستا ڕاستەوخۆ قسە لەسەر ئەزموونە هەستەکیەکانی خۆی دەکات و ئاسۆی شیعریشی زیاتر لەوەی عیرفانیانە و میتافیزیکیانە بێت، تۆماری ئەزموونە

تایبەتیەکانی خۆیەتی و ڕەهەندی بڕوادارانە، ئیمانیانە و پیرۆزانەی شیعر، کاڵبۆتەوە. لەبەر ئەوە نە شیعر سوود لە زمانی عیرفانی وەردەگرێت و نە ئەو فۆرمەی شیعری کلاسیکیش کاراییی خۆی ماوە، یان سوودی پێویستی لێوەردەگیرێت، چونکە ناوەڕۆکی شیعری ئەم کات و سەردەمە، فۆرمێکی تر دەخوازێت، کە زیاتر ڕووتبوونەوەی مانایە نەك داپۆشین و شاردنەوەی مانا. من نازانم ئەم بیرکردنەوەیە تا چەندە دەتوانێ لە ڕاستەقینەی ئەو کێشەیەمان حاڵی بکات، بەڵام من لە ئێستادا بە شێوەیەکی گشتی دەتوانم ئاوا قسانی لەبارەوە بکەم، خۆ ئەگەر مرۆڤ وردتر دابنیشێ و گفتوگۆی لەبارەوە بکات، بۆی هەیە بۆچوونی تر کەڵاڵە بکرێن و مەسەلەکە پتر ڕوون ببێتەوە..

**موسعەب ئەدهەم: گەر بە پۆلبەندی جیهانی مۆدێرنە و جیهانی پێش مۆدێرنە "کۆن و کلاسیك" قایل بین. بۆچی لەسەردەمی نوێ و تەکنۆلۆژیادا ناتوانین ئەو ئەدەبیاتەی کە لەسەردەمی پێش مۆدێرنەدا هەبووە و چەندانی وەك "مەحوی و مەولەوی و نالی و... هتد"ی بەرهەم هێناوە، لەم سەردەمەشدا مرۆڤی لەو جۆرە بەرهەم بهێنێت؟**

ڕێبوار سیوەیلی: سەرەتا، بە بڕوای من ئەم پۆلێنبەندیە لە دونیای ئێمەدا بۆ پێشمۆدێرن و مۆدێرن، ڕاست نییە و ئێمە هێشتا نە بەتەواوی لە پێشمۆدێرنەوە گواستومانەتەوە بۆ مۆدێرن و نە مۆدێرن لە کۆمەڵگای

ئێمەدا چەسپاوە. بەڵام دەتوانین ئاماژە بە گواستنەوەیەك بکەین، کە کۆمەڵگای پێشمۆدێرنەوە بەرەو جیهانی مۆدێرن ڕوویداوە، ئەویش نەك بە ئیرادەی خۆمان و زیاتر بە هۆی لاساییکردنەوە، یان کاریگەریی جیهانگەراییەوە. باشترین وەسف بۆ دۆخی کۆمەڵایەتی و کولتووریی ئێمە ئەوەیە بگوترێ: ئێمە دەستمان لە هەندێ ڕەگەزی کۆمەڵایەتیانە و کولتووریانەی پێشمۆدێرن هەڵگرتووە و هەندێ ئیلەمێنت و ڕەگەزی شێوەمۆدێرن و مۆدێرنمان وەرگرتووە، ئەویش زیاتر لە بواری ماتەریالی و تەکنەلۆژیدا و بووینەتە مشەخۆرێك و مەسرەفکەرێکی کەرەستە مۆدێرنە تەکنەلۆژییەکان. ئەم بارودۆخە کاریگەریی کردۆتە سەر جۆرە ئەدەبیەکانیش و ژانری ئەدەبی لە زیادبووندان، بەڵام لە ڕووی کواڵیتە و جۆرایەتییەوە، هەژار و دەستەپاچەن. ڕەهەندێکی تری ئەم کێشەیە، پەیوەندی بەخێراییی کات و گوشاری ژیانی شێوە مۆدێرنەوە هەیە، کە مرۆڤ تیایدا لە ڕاکەڕاکێکی بەردەوامدایە و ناچارە لەیەك کاتدا سەرقاڵی چەندین لایەنی ژیان بێت، بەبێ ئەوەی بتوانێ بەتەواوی خۆی بۆ ئەدەب تەرخان بکات. هۆکاری کات لە داهێنانی ئەدەبیاتی بەرز، پەیوەندی بە ڕەخسانی دەرفەت و خەمڵانی جیهانی ناخەکی و دەروونیی نووسەرانەوە هەیە، ئەگەر نووسەر نەتوانێ لەناو کات و لەژێر گووشاری کاتدا، جیهانە ناخەکییەکەی خۆی بخوڵقێنێ و گەشەی پێبدات، جۆر و ئیستاتیکای

ئەدەبەکەی دادەبەزێت. لەگەڵ ئەوەشدا هەر سەردەمە نووسەر و شاعیری گەورەی خۆی بەرهەم دەهێنێت و مەرجیش نییە ئەم نووسەر و شاعیرانە بە هەمان شێواز و قاڵبی هونەری بنووسن و بیر بکەنەوە. ڕەنگە زۆر پێویست بێت، نووسەر و شاعیری ئێستا لە ئەدەبی پێشووتردا قاڵ ببێتەوە، بەڵام مەرج نییە دووبارەی بکاتەوە.

**موسعەب ئەدهەم: دەروونناس و بیرمەندی بەناوبانگ "ئەریك فرۆم" پێی وایە ئێمە کەسێکمان خۆش دەوێت لەبەرئەوەیە خۆمانی تێدا دەبینینەوە، پێت وا نییە لەبەرئەوەی ئەدەبیاتی کلاسیك هێندە لە لامان بەرز و جوانە، چونکە خۆمانی تێدا دەبینینەوە؟ بۆچی ئەم ئاوێنەیە لەم سەردەمەدا بوونی نییە و گەر هەبێت بەراورد ناکرێت بە سەردەمی پێش مۆدێرنە؟**

ڕێبوار سیوەیلی: قسەکەی فرۆم سەبارەت بەو کەسەی خۆشماندەوێت، چونکە خۆمانی تێدا دەبینینەوە ڕاستە، لێ خۆشەویستیی ئێمە، یان هەندێك لە ئێمە، بۆ ئەدەبیاتی کلاسیك، بە تایبەتی شیعر، بە هەمان مانای خۆشویستنی ئەویتر نییە، هێندەی ئەوەی خۆشویستنی بەشێکە لە خۆمان کە ئەمێستا، نادیارە و لێمان ونبووە. خۆشەویستی ئێمە بۆ ئەدەبیاتی شیعری کلاسیکی، پتر لەوەی ئیرۆتیزمی لە پشتەوە بێت، خۆویستی لە پشتەوەیە، واتە ئیگۆییزم.

چـونکه ئێمـه لەگـەڵ گـۆڕان و گواسـتنەوەی کۆمەڵایـەتی و هەلومەرجـە کۆمەڵایەتیەکاندا، بەشێك لە خۆشمـان دۆڕانـد و مەودایـەك کەوتـە نێـوان ئێمە و ڕابردوومان، نێوان خۆمان و ئەوەی کە پێشتر هەبووین. ئەدەبیاتی کلاسـیك ئاوێنـەی ڕەنگدانـەوەی بـوونی ئێمـە نییـە، بـەڵکو ئاوێنـەی ڕەنگدانەوەی ئێمەیەکی گشتییە لەبەرامبەر منێکی تایبەتدا. ئێستەش نە من وەك خـۆم مـاوم و نـە دەشـتوانم ببمـەوە بـە ئێمەیـەك لـە ڕابـردوودا. بارودۆخی ئێمە لە تاراوگەکراوێك دەچێ کە نـە لـەماڵی خۆیدایـە و نـە لـە مـەنزڵی هەنووکەییـدا، ئـەو لـە هەوارگەیەکـەوە بـۆ هەوارگەیـەکی تـر کۆچدەکات و خانوو بەکۆڵ، جارێ لە نۆستالیژیا و و جارێ لـە یۆتۆپیـا و جارێکیش لە دیستۆپیا.

ئێمە لە ئەدەبیاتی کلاسیکدا ئەو بەشە لە خۆمان دەبینینەوە کە پتر مەعنـەوی و کـەمتر مـەتریالی و دونیاییـە. بـەڵام ئـەم پرۆسـەیە لەسـەردەمێکدا ڕوو دەدات، کـە سـەراپا مـادی و جیهانـەکی و ماتەریالیانەیە. ئێمە لە ئەدەبیاتی کلاسیکدا، هیچ لە خۆمـان نادۆزینـەوە بێجگـە لـەو بەشـەی شوناسـی خۆمـان، کـە ئـەم سـەردەمە ڕێگـەی بەرجەستەبوونی پێنادات. ئەگەر ئـەدیب و شـاعیرە کلاسیکەکانی ئێمـە، توانیویانە ئەوەنـدە ورد و جـوان و ڕۆحیانـە بـیر بکەنـەوە، کـە ئێسـتاش سەرنجمان ڕابکێشـن، ئـەوە بـە مانـای هاوژیـانی و هاوسـەردەمیی ئەوانـە

لەگەڵ سەردەمەکەی خۆیان و ڕۆح و ئەزموونە مەعنەوییەکانی خۆیاندا. ئەگەر بڕیارە ئێمەش بۆ داهاتوو سەرنجڕاکێش بین، پێویستە لەسەردەمی خۆماندا بژین و ئەزموونی بکەین و بەوجۆرەی کەشایانە، بەرجەستەی بکەینەوە. ئەوەی ئێمە دەیکەین، بریتی نییە لە کەشفکردنی سەردەمی خۆمان بەهۆی وشەکانەوە، بەڵکو مەسرەفکردنی وشەکانە لە سەردەم و زەمانێکدا کە هەموو شتێك تیایدا مەسرەف دەکرێ، بە زمان خۆشییەوە. ئێمە ئاوێنەمان هەیە، بەڵام ئاوێنەکەی ئێمە تەڵخ و شکاوە، پێویستە چاکیبکەینەوە و بیسڕینەوە.

**موسعەب ئەدهەم: گەر سەردەمی بەرهەمهێنانی ڕەمز و مرۆڤی مەزنی ناو شیعر و ئەدەبیاتدا بەسەر چوو بێت؟ چ شتێك جێگەی ئەوە دەگرێتەوە؟ لە بنەڕەتدا ئامانجی ئەدەبیات بە گشتی و شیعر بە تایبەتی لە ئێستا چییە و چ ئەرکێکی هەیە؟**

ڕێبوار سیوەیلی: من لەو بڕوایەدا نیم، کە سەردەمی بەرهەمهێنانی ڕەمز و مرۆڤدۆستی لە شیعر و ئەدەبیاتدا بەسەر چووبێت، ئەمە خوێندنەوەیەکی دروست نییە بۆ شیعر و ئەدەبیات بە گشتی. وێڕای هەر قەیران و بەپەراوێزخستنێك کە ئەدەبیات و بە تایبەتیش شیعر تێیدەکەون، بەمانای ئەوە نییە کە ناتوانن بەرهەمهێنەری سیمبوولی مەزن و نەمر بن. ئەمەش لەبەر ئەوەی لە بنەمادا سیمبوول بۆخۆی بەرهەمێکی

ئەدەبی و شیعرییە، تا سیاسی و ئایینی و تەنانەت ئابووریش. ئەوە ڕاستە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆکەدا بواری بەرهەمهێنانی ڕەمز، وەك ئەوە وایە کەوتبێتە دەستی سیاسەت و ئابووری، بەڵام ئەو ڕەمزانەی لەو دوو کایەیەدا بەرهەمدێن، ڕەمزی ڕاستەقینە نین و سیمبوولی بازاڕیانەن، چونکە ناتوانن بەهۆی ئەو ڕەمزانەوە بڕێ لە یەکسانی و مرۆڤدۆستی و دادوەری و ئاشتی بگێڕنەوە بۆ ژینگە مرۆڤایەتییەکە. ڕەمزەکانی ناو سیاسەت و ئابووری دروستکراون، بەرهەمهێنراو نین، بۆیە مانەوەشیان پەیوەستە بەو فڕوفێڵ و خەرجییەی لە دروستکردنیاندا تێیان چووە و تەمەنیان هەر بەقەد کەرەستە پێکهێنەرەکانیان دەبن. لە کاتێکدا ڕەمزەکانی ناو ئایین، لەمانە بەهێزترن، چونکە ڕەمزی دوورمەوداتر و جەوهەری ترن بۆ بەرەی مرۆڤایەتی و مانەوەشیان پابەند نییە بە بازاڕ و مەسرەفکردنەوە. ڕەمزی ئەدەبیات لەهەموویان بەهێزترە، چونکە ئەدەبیات و بەتایبەتی شیعر، ئەو ڕەمزانە دەخوڵقێنن کە پەیوەستن بە بوونی مرۆیی و ڕەهەندە مەعنەوی و ڕۆحییەکەیەوە. چۆن ناتوانین پێشبینی مرۆڤ بکەین بەبێ ڕۆح و مەعنەوییەت، ئاواش ناتوانین پێشبینی ئەدەبیات و شیعرێکی ڕەسەن بکەین بەبێ ڕەمزەکانی. ئەوەش ڕاستە کە ئامانجی ئەدەبیات، بە بەراوورد بە ئەدەبیات و شیعری کلاسیکی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەڵام بەمانای ئەوە نییە کە ئەم شیعر و ئەدەبیاتەی

ئەمڕۆ توانای بەرهەمهێنانی ڕەمز و کەسایەتی مەزنی لە بواری خۆیدا نییە. ئەمڕۆ ئەرکی ئەدەبیات، بە پێچەوانەی شیعری کۆنەوە، کە لە هەوڵی کەشفکردنی دەروونیانەی میتافیزیك و جوانیی خودا و ڕاستەقینە و کەماڵدا بوو، خەریکە بە کەشفکردنی ناخەکی مرۆڤ خۆیەوە. جیهانی ناخەکی و لۆگۆسی تایبەتی مرۆیی بۆ ئەدەبیاتی ئەمڕۆ، لە ئەرکە هەرە گرنگەکانە. جیهانێك، لە ئەدەبیاتی پێشووی ئێمەدا، دیار نییە چونکە ئەم ئەدەبیاتە ئەرکی خۆی کردبووە قسەکردن لەسەر دونیای عیرفانی و پیرۆز، پاشان جیهانی شۆڕش و بەرگری و بەستنەوەمان بە کۆمەڵگایەکی دەستەگەرایی و گرووپ سەنتەرەوە، کە ڕێگەی بە دەرکەوتنی تاکەکەس نەدەدا. ئەمێستا واقیعەکە گۆڕاوە و ئێمە لەسەرەتاکانی بەرجەستەبوونی کۆمەڵایەتیانە و ناخەکیانەی تاکەکەسداین و ئەدەبیاتیشمان پێویستە بەرەو ئەو شوێنە بڕوات کە تاك لەدایك ببێت. پێویستە ئەدەبیات و شیعری ئێمە هەمان دەور ببینێ کە سوکرات لە یۆنانی کۆندا دەیگێڕا و دەیگوت کاری ئەو مامانی کردنە، بۆ ئەوەی هاوڵاتیان بەکەمترین زەحمەت بیرۆکە و ڕوانینەکانیان دەربڕن. بە بڕوای من ئەدەبیات لە ئێستای وڵاتی ئێمەدا، پێویستە مامانی بکات بۆ لەدایکبوونی مرۆڤێکی نوێ و کەسایەتیەکەی لە ڕەهەندێکی جوانیناسانەدا بەرجەستە بکات.

**موسـعەب ئەدهـەم: بـە بۆچـوونی بـەڕێزتان دەبێـت میتـۆدی مامەڵەکردنمان بـۆ خوێندنـەوەی دەقـە کلاسـیکی و شـیعری شـاعیرە مەزنەکانمان، چی بێت؟**

ڕێبوار سیوەیلی: تێکەڵکردنێکی میتۆدیی زۆر لەلای ئێمە هەیـە، چ لـە ئاستی زانکۆکان و بەشە زانستییەکانی وەك بەشە کوردییەکان، چ لەسـەر ئاسـتی ڕەخنـەی ئـەدەبی بەگشـتی. هۆکـاری هـەرە سـەرەکی بـۆ ئـەم تێکەڵکردنەش دەگەڕێتەوە بۆ سنوورداری و هەژاریی دانابیمان بە گرنگیی میتۆد و جۆرەکانی. میتۆد وەك وانەیەك ناخوێندرێ و ئەگەر بشخوێندرێ وەك وانەیـەکی لاوەکـی لێهـاتووە و پسـپۆڕانی بـواری میتۆدەکـانیش زۆر دەگمـەنن. ئەمـە جگـە لـەوەی بەشـە زانسـتییەکانی ئێمـە لـە بـواری شـیکردنەوە و ڕەخنـەی ئەدەبیـدا لەسـەر چـەند کلێشـەیەك دەڕۆن و زۆر هاکەزایی و ڕواڵەتیانە کار لەسەر ئەدەبیات دەکەن. هەرچی ڕەخنـەگرانی ئـەدەبی و شیعریشـن، زۆر بـە کـەمی و لاوازی کێشـەی میتـۆد چارەسـەر دەکەن و پێوەی پابەنـدن. ئـەوان پـتر کـار لەسـەر دیـدێکی نەخـەملێوی خودباوەڕانە دەکەن، کە بەبێ میتۆدیش دەتوانن قسـەی خۆیـان بکـەن و هەڵچوونە دەروونییەکانی خۆیان لەسەر ئەدەبیات، بەپێی پێوەرە تایبەت و سایکۆلۆژییەکان دەربـبڕن. پاشـان گۆڤـار و کەناڵـە ئەدەبییـەکان هـیچ فلتەرێکی میتۆدیکییان نییە و لەوبارەیـەوە پـرس بـە شـارەزایان ناکـەن.

سەنتەر و قاوەخانە کولتووریی و ئەو شوێنانەی تریش لە چالاکییە ئەدەبییەکانیاندا، مەرجی میتۆدیبوونی کارەکانیان بەلاوە گرنگ نییە. هەموو ئەمانە پێکڕا کێشەیەك بەرجەستە دەکەن، کە کێشەی میتۆد و نەبوونییەتی.

وێڕای ئەم کەموکوڕییەش، ئەمڕۆکە میتۆدگەلێکی زۆر گرنگ هەن کە ئێمە دەتوانین سوودیان لێوەربگرین بۆ خوێندنەوەی ئەدەبیانەی دەقە کلاسیکییەکانمان و بەهۆیانەوە زۆر نهێنی جوانیناسانە، ماناناسانە و پێکهاتەییانەی ئەو دەقانەمان بۆ بەدیار دەکەوێت. بۆ نموونە ڕەخنەی دەروونشیکاری، ڕەخنەی کۆمەڵایەتی، چ لە ڕوانگە سیاسی و کۆمەڵایەتییە مارکسیانەکەیەوە بێت، یان لە ڕوانگەی فیمینیستییەوە. شیکردنەوەی گوتار، ڕەخنەی هیرمنۆتیکی، نیشانەناسیی ئەدەبیات و هەر میتۆدێکی دیکەی ئەم جۆرە ئاڕاستانە یارمەتیدەرێکی باشن بۆ قسەکردن و تێگەیشتن لە نێرەر (نووسەر)، پەیام و وەرگری ئەدەبیات. نووسینەکانی، وەك باشلار، یۆنگ، گادامێر، بنیامین، ئۆمبێرتۆ ئیکۆ، جاناتان کۆڵلەر، هانز ڕۆبێرت یاس، دێریدا، بارت و ئیدوارد سەعید، سپایڤیك و چەندانیتر یارمەتیدەری باشی کارپێکردنن بە میتۆدی ڕەسەن و سوودمەند. مەرجیش نییە ئێمە لەگەڵ مۆدێلەکاندا بڕۆین، مەرجیش نییە هەموو میتۆدێك کاراییی خۆی پیشان بدات، بەڵام خۆ دەتوانریٚ

چەند میتۆدێك هەڵبژێردرێ و کاراییەکەی لەسەر ئەدەبیاتی کلاسیکمان تاقیبکرێتەوە. پێویستە ئێمە خۆمان لە قەفەسی فیلۆلۆژی و مێژوویی و واقیعگەرایی ڕزگار بکەین، کە لە میتۆدە هەرە باوەکانی خوێندنەوەی ئەدەبیمانن.

# حیکمەتی کوردی لەناو ئەدەبیاتدایە

## گفتوگۆ لەگەڵ " تەحسین حەمەغەریب"

**موسعەب ئەدهەم: پۆلبەندی بەڕێزتان بۆ ئەدەبیات و مێژووی ئەدەبیات بە گشتی و ئەدەبی کوردی بە تایبەتی چییە؟ هەروەها ئەم پۆلبەندیدە لەسەر چ بنەمایەکە؟**

تەحسین حەمەغەریب: بە ناوی خوای بەخشندەو میهرەبان، سوپاس بۆ جەنابتان بۆ ڕەخساندنی ئەم هەلە، لە ڕاستیدا ئەگەر سەیری ڕابردووی نەتەوەی کورد بکەین وەکو هەموو نەتەوەکانی تری ناوچەکە، ئەگەر بە کورتترین ڕستە وەکو دەڵێن ڕستەی یەکەمی هەر بابەتێك ڕوگەی ئەو بابەتە دیاری دەکات، لەوێوە دەست پێ بکەم، بە بۆچوونی من، ئێمە کتێبی فەلسەفیمان نییە، حیکمەتمان هەیە، حیکمەتی کوردی وەکو هەموو نەتەوەکانی تری ڕۆژهەڵات لەناو ئەدەبیاتدایە، لەبەر ئەوەیە لەم دوادوایەدا بە بەدواداچون بۆ ئەم مەسەلەیە بە گوێگرتن لەخەڵکی تر و خوێندنەوەی بابەتی تر تا ڕادەیەك شتێکم بۆ دروست بووە، ئەویش ئەوەیە ئەوەی لە ئەدەبیاتی ئێمەدا بوونی هەیە حەقیقەتە نەك مەجاز. واتە: شاعیرەکانی ئێمە حیکمەتەکانی خۆیان هێناوە و لە ناو ئەدەبیاتدا نووسیویانەتەوە، ئەوەی لە یۆناندا بە فەلسەفە وتراوە ئێمە لە ناو شیعر و ئەدەبیاتدا وتراوە، وە ئەوەش کەمییەك نییە، ڕوگەی یان ڕێگەی دەربڕینی حیکمەت لە وتی ئێمە ئەدەبیاتە

نەك كتێبە فەلسەفییەكان، لەبەرئەوە ئەدەبیات پێگەیەكی گەورەی هەیە، بە تایبەتیش حیكمەتی ڕۆژهەڵاتی و حیكمەتی كوردی حیكمەتێكی گەرم و گوڕە، یانی ئەگەر تەعبیرە نوێیەكە بەكار بهێنین، سۆزمەندی تیایدا دیارە و تەنیا حیكمەتی وشك و حیكمەتی سارد نییە، وەكو ئەوەی (بەردابیس) دەڵێت: حیكمەتی عیشقە. ئەم حیكمەتە ئەكاتە خودی شاعیرەكە خۆی و خودی كەسەكە خۆی، بەتەواوی لەناو ئەدەبیاتدا دەركەوتووە بەو گەرم و گوڕییەی خۆی، ئەگەرچی ویستویانە ساردی بكەنەوە وەكو ئەوەی (مەولانا) دەفەرموێ: هەزارجار ئاوی پێدا كراوە تا گەیشتۆتە دەستی ئێمە، بەڵام ئەگەر هێشتا دەستی لێبدەی خەریكە پەنجەمان ئەسوتێنێت.

بە بۆچوونی من ئەمە بە ئەدەبیات دەرنەئەبڕدرا، بەڵكو ئەدەبیات توانیویەتی ئەوە بكات، ئەدەبیات توانیویەتی ڕاستگۆیانەتر ئەمە بگەیەنێت، هەتا ئەگەر بكرایەتە فەلسەفە و كتێبی فەلسەفی، ئەگەر چی فەلسەفەی كلاسیك بە تەواوی فەلسەفەیەكی سارد نییە، ئەم دیوە گەرمەی تیایە یانی كشاوە بۆ لای ئەدەبیات، بەلام لە ڕۆژهەڵاتدا بە تایبەتیش لای ئێمە ئەو حیكمەتە گەرمە لەناو ئەدەبیاتدا ڕەنگی داوەتەوە. لە ڕاستیدا من ویستومە هەر وەكو بوارەكانی دیكە ئەو كتێبە بخوێنمەوە كە پێشتر خەریكی كۆكردنەوەی بوم، ئەوترێت هەر كەسێك تا چل ساڵی خەریكی نووسینی كتێبێكە، لە چل ساڵی بەدواوە خەریك خوێندنەوەی ئەو كتێبەیە كە لەو ساڵانەدا نووسیویەتی، بەندەش وەك ئەوەی كە تا ئێستا چیمكردووە لەو بوارانەی كارم تێدا كردووە ئێستا خەریكی خوێندنەوەیانم. بۆ نموونە لە بواری

نەتەوەدا، لە بواری فەلسەفەدا، لەبواری ئاییناسیدا، هەوڵمداوە تیۆریای خۆم هەبێت، خەریکی خوێندنەوەی ئەوەبم کە نوسیومە. لەم خوێندنەوەیەشدا بە بۆچوونی خۆم هەندێك تیۆریام دەستکەوتووە کە داهێنراوی خۆمە، هەروەها لە ئەدەبیاتیشدا ویستومە ئەوەی لە ڕابردوودا لەگەڵ ئەدەبیاتدا کردوومە جارێکی تر بیخوێنمەوە. لە چلْ ساڵی ڕابردوودا ئەگەر بڵێم کە مێژووی ئەدەبیات هەر لە منداڵیمەوە بوونی هەبووە، بە تەحدید بیرمە لە قۆناغی سەرەتایی شیعری مەولەوی لە ماڵی ئێمەدا حزوری هەبووە، ئەگەر زۆر نەچمە ناو ئەو بابەتەوە هەتا ئێستا بیرم لەوە کردەوە کە تا ئێستا من چیم کردووە لەگەڵ ئەدەبیاتدا، چۆن لەگەڵیدا ژیاوم، ئەدیبەکان، حیکمەتی ئەدەبی ئەوەی کە ناوم نا حیکمەت، چی بە من ڕاگەیاندووە.

بە شێوەیەکی گشتی ئەتوانم بڵێم ئەوەی بووەتە تیۆریایەك کە جیاوازە لەو تیۆریا باوانەی کە لە ئەدەبیات و ڕۆشنبیری ئێمەدا باون. لە ڕووی مێژووییەوە ئەگەر ئارکۆلۆجیانە هەڵکۆڵین بکەم بۆ ئەدەبیاتی کوردی بە بۆچوونی من ئەدەبیاتی ئێمە چەند قۆناغێکی بڕیوە. ئەدەبیاتی کوردی ئەدەبیاتێکە لەو کەسە ئەچێت کە فڕێدرابێتە بیابانێکەوە و لە پڕێکدا دروست بووبێت بە بێ ئەوەی ئاماژەیەك هەبێ لەکوێوە هاتووە و بۆ کوێ دەڕوات! ئەو کەسەی کە خەڵکی دارستانە، خەڵکی شوێنێکی تەڕە. کاتێك کە ڕێی ئەکەوێتە بیابان لە بیریەتی کە خەڵکی شوێنێك بوو، بەڵام ئێستا نازانێت لە کوێیە. بە بۆچوونی من ئەدەبیاتی ئێمە ئەو کەسەیە کە لە بیابانێکدا لە سەدەی نۆزدە فڕێدرا لەسەر زەویەکدا کە نەیدەزانی کوێیە، بەڵام لە پڕ ئەو سەر زەوییەی دۆزییەوە،

سەر زەوی خۆی دروست کرد، ئەو بیابانەی کردە مەملەکەتێك بۆ خۆی. بۆیە بە بۆچوونی من نەتەوەکانی تر ئەگەر پێشتر ئەو حیکمەتەیان نوسیبێتەوە، کردبێتیان بە دیوان، کردبێتیان بە قوتابخانە، وەکو ئەوەی ئێرانییەکان دەڵێن، ئەوا سەبك و ئەدەبیاتی کوردی لە سەدەی نۆزدەدا دەست پێدەکات. ناڵێم نەمان بووە! ئاگام لێیە پێشتر ئەحمەدی خانی، مەلای جزیری تا ڕادەیەك ئەکەوێتە پێش ئەو قۆناغەوە، بەڵام وەکو ئەوەی کە ببێتە ستایلێکی باو، هەروەها لە هەموو شێوە زارەکاندا لە یەك کاتدا بەو کامڵییەی کە بکرێت ناوی بنێین ئەدەبیات لە سەدەی نۆزدەوە دەست پێدەکات. لەو کودەتا ڕۆحییەوە، لەو سەفەرە ڕۆحی و وەرچەرخانە ڕۆحییەوە کە مەولانا خالیدی نەقشبەندی (هەڵبەت دۆخەکە وابوو کە مەولانا خالیدی دروست کردووە). ئیتر ئەدەبیاتی کوردی بە هەموو شێوەزارەکانەوە هەر لە شێوەزاری هەورامی تا شێوەزاری ناوچەی سلێمانی و شێوەزاری کرمانجی ژورو دەست پێدەکات لەو قۆناغەدا ئەتوانین ئەدەبیاتی کوردی بەراورد بکەین، بەو ئەدەبیاتەی کە لە ئەدەبیاتی فارسیدا پێی دەوترێت (سەبکی عێراقی) کە سەبکی عێراقی سەبکێکی تەواو مەعریفی و ڕۆحانییە. داستانی سەدەی نۆزدەی ئەدەبیاتی کوردی داستانی دڵە، مامەڵەی قەلبە، مامەڵەی ڕۆحیە. لە ڕاستیدا لەو قۆناغەدا دڵ سەنتەرە، ویساڵ و فیراق سەنتەرە، عیشق سەنتەرە. ئەو قۆناغە کە ئیتر لە کتێبی ( دڵ و چاو)یشدا وتوومە کە بابەتی دڵ لای مەولەوی تاوەگۆزی (هەڵبەتە پێش مەولەوی لای بێسارانی کە مەولەوی بە شێخی کامڵ ناوی ئەبات)، چاویش لای نالی دەبێتە سەنتەر. بەڵام ئاگامان لێبێت چاو لەو قۆناغەدا ئەو چاوە

ئاساییەی ئێستا نییە، چاوی دڵە کە دەکرێتەوە. (دید) لای نالی سەنتەرە، لەو قۆناغەیە کە باس باسی بینینە، بینینی بابەتە مەعنەوی و ڕۆحیەکانە، گواستنەوەیە لە باسی بیستنەوە بۆ باسی بینین، باسی گەرمی دڵە کە لای مەولەوی بوونی هەیە لەو قۆناغەدا کە ئەتوانین بڵێین قۆناغی بابەتە مەعنەوییەکانە. عیشق سەنتەری و چاو سەنتەری و دڵ سەنتەری بەو مانا ڕۆحییە دەبێتە قۆناغی یەکەمی ئەدەبیاتی کوردی. ئەو کاتەی کە دیوان دروست دەبێت شاعیرە کوردەکان شانازی بەوەوە دەکەن کە بە کوردی دیوانیان هەیە.

قۆناغی دووەممان هەیە کە قۆناغی حاجی قادری کۆییە، کە لە حاجی قادردا دەگاتە لوتکە، کە ئەویش قۆناغێکە کە بابەتە ڕۆحی و مەعنەوییەکان لە باسی دڵ و چاوی نالی و مەولەوییەوە دەگوازرێتەوە بۆ بابەتی زەین (بیرکردنەوە). زەین (ئەندێشە) جێگەی دڵ ئەگرێتەوە، لەبەر ئەوە ئەبینین زۆرتر حاجی قادر وەك ڕەخنەگرێکی کۆمەڵایەتی ناو نراوە، وەك ڕیفۆرمیستێکی ئایینی ناو نراوە، ئەمە ئەو قۆناغەیە کە قۆناغی بیرکردنەوەیە، زەین سەنتەرە، بیرکردنەوە سەنتەرە، مەعریفە سەنتەرە. لەبەرئەوە حاجی قادر لە ئانی گواستنەوەدایە، پێیەکی لە سەردەمی پێش مۆدێرنەدایە، لە باسی قەلب و دڵ و مەعنەوییەتگەراییەدا کە بەشێکی شیعرەکانی بۆ خۆی دەبات و، پێیەکیشی لەمدیوە کە لە ئانی گواستنەوەدایە، لای حاجی زەین دەبێتە سەنتەر، بیرکردنەوە دەبێتە سەنتەر، ئەمە قۆناغی دووەمە کە ڕەخنەی کۆمەڵایەتی و چاکسازی لەناو کۆمەڵگا و باسی دروستبوونی بابەتە کوردییەکان

دەستپێدەکات. ئەمە قۆناغێکە کە دەستپێدەکات قۆناغێکە بە تەواوی ئەمدیوی نییە، قۆناغێکی ڕاگوزەرە لە نێوان ئەمدیو و ئەودیو، لە باسی مەعنەوییەتەوە بۆ باسی ئەمدیو کە باسی مۆدێرنەیە.

دوای حاجی قادر ئەدەبیاتی کوردی بەو شێوازە تا ئەوکاتەی داگیرکەر دێتە ڕۆژهەڵاتەوە، ڕۆژاواییەکان دێن و لەگەڵ خۆشیان چاپخانە دەهێنن، چاپخانە دیوە زبرەکەی سەردەمی مۆدێرنەیە لەگەڵ چەك و چاپخانە دێت، بەڵام دیوە نەرمەکەی سەردەمی نوێش کە بریتییە لە بابەتە نەتەوەییەکان دێنە ئێرە، لێرەوە کاتێك ڕۆژنامە دەردەکرێت، چاپخانەیەك لە هەولێر دادەنرێت و چاپخانەیەکیش لە سلێمانی دادەنرێت، ڕۆژنامەی پێشکەوتن دەردەکرێت، لەو قۆناغەدا جۆرێکی تر لە ئەدەبیاتی نەتەوەیی (نەتەوە بە مانای مۆدێرن، نەتەوە بە مانای دەوڵەتی نەتەوە). نەتەوە سەنتەری دروست دەبێت، کە لە شیعرەکانی شێخ نوری شێخ سالح و هاورێکانییەوە دەستپێدەکات، زۆرتر بە میتۆدکردن و ئیلهام وەرگرتن لە ئەدەبیاتی نەتەوە ڕۆژاواییەکان بابەتە نەتەوەییەکان چ نەتەوە نزیکەکان و چ دوورەکان.

**موسعەب ئەدهەم: گەر بکرێت زیاتر ڕونی بکەنەوە؟**

تەحسین حەمەغەریب: بۆ نموونە لە ئەدەبیاتی تورکی سوود دەبینن. جۆرێك لە شیعری کوردی و ئەدەبیاتی کوردی دەستپێدەکات ئەو قۆناغە بەردەوام دەبێت هەتا ئەو کاتەی کە ئینگلیز بە دیاریکراوی لە وڵاتی ئێمەدا هەستدەکات جێگەی خۆی کردووەتەوە، هەستدەکات ئەو سەرەتایەی

دامەزراندووە کە پێی دەوترێت ئەدەبیاتی نەتەوەیی. ئیدی کوردەکان لە قۆناغی دواتردا خۆیان دەبنە خاوەنی چاپخانە، دوای گەڕاندوەی پیرەمێردی نەمر و دەرکرنی گۆڤار و ڕۆژنامەکان لەو قۆناغە ئیتر جۆرێك لە ئەدەبیات بە مانای ئەدەبیات نەك بابەتە نەتەوەییەکان دروستدەبێت، کە دیعایە بۆ بابەتە نەتەوەییەکان دروستدەبێت ئەوەی کە پێی دەوترێت ڕۆمانسیەت، خەیاڵ جارێکی تر دێتە ناوەوە. بە بۆچوونی من ئەم قۆناغە لەگەڵ گۆراندا لە لوتکەدایە بەردەوام دەبێت تا شەستەکان، واتە شیعری گۆران (هەرچەند دەکەم ئەو خەیاڵەی پێیەوە مەستم)، پێوەی مەستە لەبەرئەوەی ناخرێتە ناو هەڵبەستییەوە، ئەوە ئەم بابەتەیە.

دوای ئەوە ئەدەبیاتی شۆڕشگێڕی دەستپێدەکات، ئەمەش لە شێرکۆ بێکەسدا خۆی دەبینێتەوە. هەروەها ئەوەشمان لەبیرنەچێت لە قۆناغی پێشودا ئەم ڕۆمانسیەتە کە گۆران سەرمەشقی دەبێت، هەروەها کامەران و زێوەر لە شاعیرەکانی ئەو قۆناغەن و لە ئەحمەد هەردیدا تەجەلا دەبێت و ئەگاتە لوتکە و لە دیوانی ڕازی تەنیایدا بە تەواوی نومایاندەبێت لە شیعری ست فاتمەدا. دوای ئەوە ئیتر ئەدەبیاتی حەماسی و شۆڕشگێڕانە و ڕووبەڕووبوونەوە دەستپێدەکات، ئەمەش لای شێرکۆ بێکەس بە تەواوی دەگاتە لوتکە. دواتریش لای عبدوڵڵا پەشێو و پاشانیش لەناو دینییەکانیشدا لە هەشتاکاندا کرێکار ڕۆڵێکی گرنگی دەبێت لەو بابەتەدا، دوای ئەوە ئەم ئەدەبیاتە بەردەوام دەبێت هەتا ڕاپەڕین، لە ڕاپەڕین بە دواوە ئیتر قوتابخانە ئەدەبییەکان دێنە ناو ئەدەبیاتی کوردییەوە. هەڵبەت نابێت ئەوەمان لەبیر

بچێت لـه ڕۆژنامـەی هاوکـاری پـێش ڕاپـەڕین ئـەو گەنجانـەی کـە ناسـراون بـە (گەنجەکان یـان ڕەهەندییـەکان)، هەنـدێك بابـەت لەسـەر فەلسـەفەی وجـودی و شیعری وجـودی و حەمـە عومـەر عوسمـان و ئـەو قۆناغـە دەردەکـەوێت، بـەڵام دواجار ئەدەبیات بەو مانایەی کە تەوزیفکردنی بابەتە نوێیەکان و ئیتر لـە دوای ڕاپەڕینـەوە بـە دیـاریکراوی لـە ڕەهەندییەکانـدا زۆرتـر نومایـان دەبێـت، کـە وادەکات تەنانەت شاعیرێکی وەکو شێرکۆش بیهێننەوە خوار لە ئاستی خۆیـان کـە بابەتـە وجودیـەکان و بابەتـە ئەنتۆلۆژیـەکان لایـان ببێتـە سـەنتەر. بۆیـە دەبینین ڕەهەندییەکان خۆیان زۆرتـر یـان چیرۆکنووس بـوون یـان شـاعیربوون ئەگەرچی دواتر وەك بیریار یان نووسەر و ڕۆشـنبیر دەردەکـەون، ئـیتر هـەر لـە بـەختیار عەلییـەوە تـا ڕێـبین هـەردی و تـا مـەریوان وریـا، کـە لـەم بابەتانـەوە دەسـتیان پێکـردووە، بـەڵام لـەم قۆناغـەدا جـۆرێکی تـر لـە ئـەدەبیات لـە پەراوێزیشدا بوونی هەیە کە بە بۆچوونی من ئەمە لە داهـاتودا سـودێکی گرنگـی دەبێـت، ئەمـەش گەڕاندنەوەیـە بـۆ مەعنەوییـەتی لای کلاسـیك، هێنانـەوەی ئەدەبیاتی عیرفانی، مەرج نییە ئەدەبیاتی عیرفانی بەو زمانەی کە لە کلاسیکدا بوونی هەبووە، بـەڵام جۆرێـك لـە جۆرەکـان گەڕاندنەوەیـە بـۆ ئـەو قۆناغـە. بـۆ نموونە ئەوەی لای ئەکرەم عەنەبی و لای عیرفـان موسـتەفا تـا ڕادەیـەك بـوونی هەیە، قۆناغیکە بە بۆچوونی من ئێسـتا دەبیـنین تەنانـەت زۆر لـەو خەڵکانـەی کـە خـەڵکی نـادینی ناسـراون بـە شـوین خۆیـدا ڕایکێشـاون، واتـە جۆرێـك لـە ئـەدەبیاتی عیرفـانی و مەعنـەوی و جـۆرێکی تـر لـە مامەڵـەی عیرفـانی لەگـەڵ ئەدەبیاتدا دەستی پێکردووە. ئەمە لە چیرۆك و ڕۆمـان و شیعریشـدا دەبیـنین

که ئەمە لە پەنای ئەوەی لە دوای هاتنی ئینگلیزەوە بۆ ئێرە لە پەراوێزدا بوونی هەبووە، ئێستە جارێکی تر کەوتووەتەوە سەنتەر و جارێکی تر ڕۆڵی خۆی دەبینێت.

بە بۆچوونی من ئەدەبیاتی کوردی ئەم قۆناغانەی بڕیوە، قۆناغی دڵگواستنەوە بۆ قۆناغی زەین، وە گواستنەوە بۆ قۆناغی خەیاڵ، دوای ئەوە هاتنی سەردەمی مۆدێرنە کە خەیاڵ و ڕۆمانسیەت دەگاتە لوتکە ئینجا ئەدەبیاتی حەماسی و ئەدەبیاتی ئەنتۆلجیی وجودی و فەلسەفەی وجودی عەبەسی کە لە ئەدەبیاتدا ڕەنگی داوەتەوە، پاشان گەڕانەوە بۆ ئەدەبیاتی عیرفانی.

**موسعەب ئەدهەم :ئێمە لە سەردەمی ئێستادا کە باسی فەزای کوردی دەکەین، با بڵێین شیعر ئەو ڕۆڵەی نەما وەك ئەوەی کە ڕۆمان هەیەتی، یان دەکرێت بڵێین ڕۆمان شوێنی شیعری گرتووەتەوە وەکو نووسەرێکیش دەڵێت سەردەمی نوێ بە ڕۆمان دەناسرێت، بەڵام پێش ئەوە شیعر ئەو ڕۆڵەی هەبووە، لای جەنابتان ئەم پەیوەندییە چۆنە؟ یاخود شیعر و ڕۆمان جێگایان چییە لەسەردەمی ئێستادا لەگەڵ سەردەمی کلاسیکدا؟**

تەحسین حەمەغەریب: لە ڕاستیدا ئەمە ڕوویەکی ئەو تیۆریا ئەدەبییەیە کە بە بۆچوونی خۆم ئیشم تێدا کردووە. کە خوێندنەوەی یەك بە دوای یەکدا هاتنی ئەدەبیات بوو کە لە وەڵامی پرسیاری پێشودا وەڵامم دایەوە، بەڵام دوو جۆری تر لە ئەدەبی هاوتەریب لە هەموو قۆناغەکانی مێژووی ئەدەبی کوردیدا

بوونی هەیە، واتە دوو ئەدەبەن هەمیشە یاری سەنتەر و پەراوێز دەکەن، یەکیان دەکەوێتە سەنتەرەوە ئەویتریان دەکەوێتە پەراوێزەوە. ئەمە بە درێژاییی ئەدەبی ئێمە لە ستراکچەری کلتووری ئێمە بوونی هەیە ئەگەرچی بە نەوتراویش بێت، واتە لە هەموو قۆناغێك هەروەك چۆن دەوترێت لە فەلسەفەدا هەمیشە ئەفلاتونییەکان و ئەرستۆییەکان یەکێکیان لە سەنتەدا بووە و ئەویتریان لە پەراوێزدا بووە، لە ئەدەبیاتیشدا جۆرێك لە دوالیزمەیی لە نێوان ئەدەبیاتی مەعنەوی و عیرفانی لەگەڵ ئەدەبیاتی دونیایدا بوونی هەبووە، جا لە هەموو قۆناغەکاندا کامیان لە سەنتەردا بوبێت ئەویتریان لە پەراوێزدا بووە، یانی کاتێك کە ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردی بابەتە عیرفانی و مەعنەوییەکان وەکو وتم بە سەبکی عێراقی دەستپێدەکات، واتە هەمووی بابەتی ڕۆحی و مەعنەوییە کە شاعیرەکانی مەولەوی و نالی و هاوڕێکانیان، لە پەراوێزدا ئەدەبیاتێکی تر هەیە پێی دەوترێت ئەدەبیاتی دونیایی بە شێوەیەکی وتراو، بۆ نموونە: ئەگەر سەیری ژیاننامەی هەریەك لەو شاعیرانە بکەیت هەموویان مەلا بوون، خوێندنی حوجرەیان هەبووە، ئەوەی کە نوسیویانە لە بوارە مەعنەویەکەدا بووەتە ئەو دیوانانەی کە ئێمە ئێستا دەیبینین، بەلام لەناو خۆشیاندا هەندێك بابەتی دونیایی هەبووە کە بە شێوەیەکی زارەکی لە نێوانیاندا گەڕاوە، لە ناو حوجرەکاندا باس کراوە. ئەم ئەدەبیاتە دونیاییە کە بە شیعر ناسراوە لە قورئاندا، لە ڕاستیدا ئەدەبیاتە مەعنەوییەکە دیوان بووە و ئەوە مەعنەوییەت بووە، ئەدەبیاتە دونیاییەکە کە لە پەراوێزدا بووە یان نە نوسراوەتەوە یان گاڵتەی پێ کراوە، ئەسڵەن جێی شانازیان نەبووە، ئەوەی بۆ

دونیا نوسیویانەتەوە بمێنێتەوە بۆ سەردەمەکانی تر بەڵام دواجار لە پەراوێزدا وجودی هەبووە. ئەم دوو ئەدەبیاتە کە من ناوم ناوە ئەدەبیاتی دونیایی، ئەدەبیاتی هەوەسبازی یان ئەدەبیاتی پەراوێزخراو لەگەڵ ئەدەبیاتی مەعنەویدا هەرکامێکیان تایبەتمەندی خۆی هەیە، بە بۆچوونی من ئەدەبیاتی عیرفانی یەکێك لە سەرەکیترین تایبەتمەندیەکانی بریتییە لەوەی ئەم ئەدەبیاتە داستانە، گێڕانەوەیە، سەرەتاو کۆتایی دیارە، چیرۆکی هەموو حزوور لەوێ وجودی هەیە، ئێمە لە کوێوە هاتوین، لێرە چی دەکەین و بەرەو کوێ دەگەڕێینەوە، داستانی فیراق و ویساڵ کە لای هەموو شاعیرەکان بوونی هەبووە کە ئێمە یان لە ویساڵداین یان لە فیراقداین، دوورکەوتوینەتەوە. ئەم داستانەیە، بە بۆچوونی من ئەمەشە کە حیکمەتی دروستکردووە. بە گوتەی یەکێك لە ڕەخنەگرەکان کە دەڵێت وەك ئەوەی کە هیچیان نەزانیبێت تەنها ئەوەیان وتبێتەوە کە داستانی بوون (ڕیوایە)، داستان کە تەنانەت خوداش لەوێ ڕاوییە شت دەگێڕێتەوە، داستانی وجود بۆ ئێمە دەگێڕێتەوە وەك ئەوەی لای مەولانا جەلالەدین بوونی هەیە، فوو دەکات بە نەیدا، لێرەدا ڕیوایەت لەم داستانە مەعنەوییەدا، لەم ئەدەبیاتە مەعنەوییەدا سەنتەرە. دواجار هەر ئەم ڕیوایەتەشە بە بۆچوونی من لە سەردەمی نوێدا ڕۆمان جێی دەگرێتەوە. لە بەرامبەر ئەوە ئەدەبیاتێکی ترمان هەیە پێی دەوترێت ئەدەبیاتی شیعری یان ئەدەبیاتی دونیایی، شیعر بۆ بابەتە دونیاییەکانە بە تەعبیری قورئانی ( فی کل واد یهیمون)، بۆچی ئەتوانین بڵێین شیعریەت سەرەکیترین سیفاتی ئەدەبیاتی دونیاییە وە لەبەر ئەوەشە شاعیرەکان زەمی شیعریان کردووە، عاریفەکان

زەمی شیعریان کردووە، خۆیان بە شیعر زەمی شیعریان کردووە. لە ڕاستیدا بە بەکارهێنانی ئامرازە شیعریە ڕەوانبێژیەکان زەمی شیعریان کردووە، لە شیعر هەڵبێ چونکە ڕاسگۆترینی درۆزنترینیەتی، واتە ئەدەبیاتێکی درۆزنانە، ئەدەبیاتێکی دونیاییانە، بۆ؟ لەبەر ئەوەی کە شاعیر شیعر دەڵێت، شاعیر لە حاڵدا دەژی، واتە ئێستە دەکرێت ئەزموونێکی هەبێت ماوەیەکی تر ئەزموونێکی تری هەبێت پێچەوانەی ئەزموونەکەی پێشوی بێت، بۆیە هەمیشە لە شیعردا پارادۆکس بوونی هەیە، هاودژی بوونی هەبووە. لە داستاندا نابێت هاودژی بوونی هەبێت، ڕۆمان جیهان ئەخولقێنێت، جیهان نابێت هاودژی تێدا بێت چونکە ئەگەر هاودژی تێدا بێت ئەوا جیهان ئەڕمێت، واتە پشتێنەی ڕۆمان فیکرە، بابەتە فیکرییەکانە، پشتێنەی ئەدەبیاتی مەعنەویش مەعریفەیە، بەڵام پشتێنەی ئەدەبیاتی دونیایی ئەزموونە، ئەزموونیش شیعرە وە بۆیەش هاودژیش لە نێوانیاندا هەیە. بۆیە قورئانیش وا زەمی دەکات کە هەر ڕۆژێك لە شیوێك دەلەوەڕێت. ئا ئەمەیە ئەم ئەدەبیاتە کە لەگەڵ ئەدەبیاتی مەعنەویدا هەمیشە ئەمیان لە سەنتەردا بێت ئەویتریان لە پەراوێزدا بووە. لە قۆناغی پێش مۆدیرنەدا کاتێك کە بابەتە مەعنەوییەکان دەبنە سەنتەر کاتێك عیرفان دەبێتە سەنتەر، کاتێك کە داستان و ڕیوایەت دەبێتە سەنتەر، ئەم شەڕە لە زمانی فەلسەفەی ئیسلامیدا بە شەڕی نێوان ماهییەت و وجود باس کراوە. ماهییەت چیرۆکە، داستانە، چییەتی بوونە، ئەم بوونە چییە؟ لە کوێوە هاتووە؟ ئەمە ڕیوایەتە بۆ کوێ دەچم؟ لێرە چی دەکەم؟ دیسان ئەمە ڕیوایەتە. لە بەرامبەر ئەوەوە ئەدەبیاتی ئەزموونی یان ئەدەبیاتی دونیایی لە

پـەراوێزدا بـووە. ڕەنگـە لـە ئـەدەبیاتی کوردیـدا لـە سـەرەتاوە وەکـو وتم بـە شـێوەیەکی زارەکـی لــە حوجرەکانــدا گێڕدرابێتــەوە، لــە بــەزمی شــەوانەی فەقێکاندا باسکرابێت یاخود جاری وا هەبووە لە ڕێگـەی خەوبینینێکـەوە بـووە، نالی خەونێکی بینیوە بە شتێکی دونیاییەوە، لەو بابەتانەدا باسـکرابێت. بـەڵام لە قۆناغەکانی دواتردا ئیتر ئەو ئەدەبیاتە دونیاییە بەرەبەرە گەورە دەبێت بـۆ نموونە لە سەردەمی شێخ ڕەزا کە ئەم دەبێتـەوە بـە سـەنتەر لای شـێخ بابەتـە مەعنەویەکان دەکەونە پەراوێزەوە. لـە سـەردەمی حـاجی قـادر بـە دواوە بـەرە بەرە ئەدەبیاتی دونیایی جێگای ئەدەبیاتی مەعنـەوی دەگرێتـەوە، واتـە کاتێـك ئەدەبیاتی دونیایی دەبێتە سەنتەر ئەدەبیاتی مەعنەوی دەکەوێتە پـەراوێزەوە، بەڵام کاتێك کە دەڵێین دەکەوێتە پەراوێزەوە مانای وا نییە کـە بـوونی نامێنێـت ئا لێرەدا وردەکارییەك هەیە ئەوەندەی کـە مـن سـەرنجم دابێـت ئـەم شـەڕە لـە نێـوان ئـەم دوو ئەدەبیاتـەدا ئەمـە ستراکچـەری ئـەدەبیاتی ئێمەیـە وە بناغـەی ئەدەبیاتی ئێمەیە، ئەگەر تەعبیری پۆڵ ڕیکۆرد بـەکاربهێنم بـەڵکو ئەمـە پـێش ستراکچەرە، واتە ئەو زەمینەیەیە کە ستراکچەرەکان دروستدەکات. لـە ڕاسـتیدا ئەگــەر ئــەم شــەڕەی نێــوان ئــەدەبیاتی دونیــایی و ئــەدەبیاتی دینــی بــە پێشستراکچەری ئەدەبیاتی ئێمە ببینی ئەتوانین بڵێین ئەمـە جـۆرێکی تـر خـۆی تەجەلا کردووەتـەوە، بۆتـە شـەڕی نێـوان یـان بڵـێین جیـاوازی نێـوان زەمـان و مەکان. هەمیشە ئەو ئەدەبیاتەی لە سەنتەردا بووە ئەدەبیاتی کات بـووە، واتـە گوازراوەتەوە، بووەتە کتێب. بۆیـە دەبیـنین لـە ئـەدەبیاتی عیرفانیـدا شـاعیرە کوردەکان شانازی بەوەوە دەکەن کـە دیوانیـان هەیـە، واتـە لـە کاتـدا دەژیـن.

بەڵام ئەو کاتە ئەدەبیاتی دونیایی لە مەکاندایە، لە کوچە و کەلەبەرەکاندایە، لە شوێنە پەسێوەکاندایە، لە ناو حوجرەکاندا بە شێوەیەکی زارەکی باس ئەکرێت، لە شوێنی خواردنەوەی مەی و شوێندایە. لە قۆناغی دواتردا کاتێك کە ئەدەبیاتی دونیایی دەبێتە سەنتەر، ئیدی ئەدەبیاتی عیرفانی دەچێتە ناو شوێنەوە، بۆیە دەبینین کاتێك لە سەردەمی نوێدا کە نوری شێخ ساڵح و هاوڕێکانی ڕۆژنامە و گۆڤاریان هەیە، ئەدەبیاتی دونیایی ئەنوسن، دیوانیان هەیە، ئەدەبیاتی مەعنەوی لە ناو شوێندایە، لە مزگەوتدایە. بۆ نموونە بێخود دەبێتە مزگەوتێك، حەتتا کەسێکی وەکو مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس کاتێك کۆچی دوایی دەکات لەبری ئەوەی لەسەر پێشنیارەکانی قسە بکرێت مزگەوتێك بە ناوی ئەوەوە دەکرێتەوە، واتە ئەگەر ورد سەرنج بدەین دەبینین کە ئەم دوالیزمە بوونە لە نیوان سەنتەربوون و پەراوێزخستنە لەنێوان ئەدەبیاتی دونیای مەعنەویدا دوالیزمەی نیوان شوێن و کاتە، ئەو ئەدەبیاتەی کە لە سەنتەردا بووە هەمیشە لە ناو کاتدایە، ئەوەشی لە پەراوێزدایە ئەچێتە ناو شوێنەوە. بۆیە ئێستە جارێکی تر ئەم بابەتە دەبینیتەوە، واتە هەتا دوای ڕاپەڕینیش ئەدەبیاتی دینی بە درێژایی بوونی هەبووە، بەڵام کاتێك کە ئەدەبیاتی دونیایی لەناو گۆڤارەکاندا و لە ناو ڕۆژنامە کوردیەکاندا هەبووە، ئەدەبیاتی دینی لە ناو مزگەوتەکاندا باسکراوە، لە مەولودنامەکاندا خوێندراوەتەوە، لەو بابەتانەدا کە بابەتە دینییەکان پابەندن بە شوێنەوە باس کراوە. بە کورتی دەمەوێت ئەوە بڵێم کە ئەم دوالیزمەیە دوالیزمەی مەعنەوییەت لە گەڵ دونیاگەریدا، شیعر لەگەڵ ڕیوایە و داستاندا هەمیشە

جێگۆڕکێیـان کـردووه، یـەکێکیان کەوتووەتـە سـەنتەر ئـەویتریان کەوتۆتـە پەراوێزەوه، ئەمە هەڵبەتـە بـۆ بابەتـە فەرهەنگیـەکان بـە شـێوەیەکی گشـتی و بابەتـە ڕۆشـنبیریەکەش بـە هـەمان شـێوه. بۆیـە دەبیـنین بـە درێـژاییی مێـژوو ڕۆشـنبیرانی کـورد دابەشـبوون بـە دوو پۆلـەوە یـەکێکیان بـەرگریکار بـوون لـە بابەتە دینییەکان کە پێیان وتون مونەویرەکان کە زۆرتر بابـەتی مەعنـەوییان لا بووه. بۆ نمونە لە سەردەمی نوێدا لە مەلای گەورەی کۆیە دەستپێدەکات، لای شێخ موحەممەدی خاڵ دەردەکەوێتـەوه، لای پیرەمێـردی نـەمر و تـا ئێسـتەش ڕۆشنبیرە دینییەکان درێژە بـەو کایـە دەدەن. لەبەرامەبـەر ئـەوە ڕۆشـنبیرە نـا دینییـەکانیش بـۆ نموونـە ئـەبینین لـە ڕەفیـق حیلمییـەوە لەسـەردەمی شـێخی نەمردا کاتێك کە (دەڵێت شێخ هـەموو جارێـك بـۆنی دەمـی دەکـردم تـا بزانێـت مەسـت نـیم) ئـا لـەوێوه تـا دێتـە شـاعیرەکان و تـا ڕۆشـنبیرەکان وە هـەتا لەمسـەردەمەدا ئەگـەر بڵـێین هـەژان بـۆ نموونـە نوێنـەری ڕۆشـنبیرە دینـی و مەعنەوییەکەیە ئەوا لە لەولاوە پرۆژەی ڕەهەند نوێنەری ئەوی ترە، تەنانەت لـە ئاستی کەسێتیدا جاری واهەیە مرۆڤەکان بەبێ ئەوەی بە خۆیـان بـزانن بـەرگری لە هەرشتێك دەکات بەرگری یەکێك لـەم شـتانە دەکـات، بـۆ نموونـە کاتێـك کـە بەختیار عەلی بەرگری لە ئـەدەبیاتی دونیـایی دەکـات ژیـان دۆسـتی یـان دونیـا دۆستی بە تەعبیرەکانی خـۆی بـەکاردەهێنێت بـەبێ ئـەوەی بـە خـۆی بزانێـت، لـەولاوە فـاروق ڕەفیـق بـەرگری لـە بابەتـە مەعنەوییـەکان دەکـات ئەگـەر چـی بۆخـۆی ئێسـتە دەڵێـت کەسـێکی مەعنـەوی نـیم. لـەم بابەتـەدا دەبیـنین کـە دیوانەکەی کە دینی خوا لە ڕۆژهەلات و ئەو بابەتانـە بـاس دەکـات، لەولاشـەوە

بــەختیار عــەلی ئیمــان و جــەنگاوەرانی دەنوســێت، کــە ئــەم دوالیزمەیــە دوالیزمەیەکە هەم لە بوارە ئەدەبییەکەدا هـەم لـە بـوارە ڕۆشـنبیرییەکەدا لـەناو ئەدەبیاتی ئێمەدا بوونی هەیە.

**موسعەب ئەدهەم: ئەگەر بۆ پۆلبەندی جیهانی مۆدێرنە و پـێش مۆدێرنـە ڕازی بیت، بۆچی لە سەردەمی نوێ و تەکنەلۆجیادا ناتوانین ئەو ئەدەبیاتەی کـە لـە سـەردەمی پـێش مۆدێرنـەدا هـەبووە کـە ئـەو شـاعیرە گەورانـەی بەرهەمهێناوە، بۆچی لەم سەردەمەدا ناتوانێت ئەو مرۆڤانە بەرهەم بهێنێت، هەمان ئەدەبیاتی مۆدێرنە بۆچی ناتوانێت مەحوی و نالی و مەولەوی بەرهەم بهێنێتەوە جارێکی تر؟**

تەحسین حەمەغەریب: لە وەڵامی پرسیاری پێشودا وەڵامـم دایـەوە کـە ئـەو ئەدەبیاتەی ئەوان نوسیویانە ئـەدەبیاتی مەعنەوییـە، ئـەوە بڵـێم بابـەتی بـوون (وجود) لە ئەدەبیاتی مەعنەویدا لە سـەنتەردا نییـە بـە پێچـەوانەی ئـەوەی کـە کەسانێکی وەکو د. موحەممـەد کـەمال بـۆ فەلسـەفەی وجـودی لـە ئـەدەبیاتی کلاسیکی ئێمەدا دەگەڕێن، داستانی ئەدەبیاتی کلاسـیکی ئێمـە داسـتانی بـوون یان وجود نییە داستانی ماهییەتە یان چییەتی بوونە، داستانی ڕیوایەتـە، خـۆی بۆ خۆی داستانە، (مەولانا) دەفەرموێت: ئێستە خۆمان بوینەتەوە بـە داسـتان. ئا لێرەوە داستان ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە شتە مەعنەوییەکانـەوە هەیـە، بۆیـە یەکێك لە مەعنەوی ناسەکان و عیرفان ناسەکان دەڵێـت: هـەموو مەعنەوییـەت و عیرفان بریتییە لەداستانی وجود کە ئێمە لە کوێوە هاتوین و لێرە چـی دەکـەین و بۆ کوێ دەگەڕێینەوە؟ ئەم داستانە لە سەردەمی مۆدێرنەدا ناتوانێت وجـودی

هـەبێت، بۆیـە کاتێـك کـە دەمانـەوێت ئـەو داسـتانە دووبـارە بکەینـەوە بۆمـان ناکرێـت، چـونکە لـە سـەردەمی مۆدێرنـەدا وجـود سـەنتەرە نـەك ماهییـەت. تەکنەلۆجیا و بابەتە نوێیەکان بە بەراورد بە پێشتر سەدبەرابەر بەهێزترە بـەڵام ئەدەبیاتی مەعنەوی لەم سـەردەمەدا ناتوانێـت بـەو شـێوەیە حـزووری هـەبێت. بـۆ؟ چـونکە ئـەو داسـتانەی لـەو قۆناغـەدا کـە حـزووری هـەبووە لـە ڕاسـتیدا داسـتانەکە بـوو مـەولانای دروسـتدەکرد، مـەحوی دروسـتدەکرد و نـالی دروستدەکرد، ئەو ئیمکانیاتی بەوان دەبەخشی کە ببن و حزووریـان هـەبێت وە خۆیان بە بەشێك لـەو چیرۆکە بزانن. ئێسـتە خـودی داسـتانەکە نـەماوە، ئیتر کارەکتەری ناو ئەو داستانە ناتوانێت بەو شێوەیە حـزووری هـەبێت، خاڵەکـە ئـا لێرەدایـە لـە سـەردەمەکانی لـەوەو پێشـدا بـوونی ئـەم داسـتانە ئەدەبییـە بەسترابوو بە بوونی قوتابخانە عیرفانی و مەعنەوییەکانیشـەوە، بـە تەریقـەکانی تەسـەوفەوە. لـە تەریقـەکانی تەسەوفیشـدا لـە مامەڵـەکانی گێـڕەرەوەی داسـتانەکان هەمیشـە دوو کـەس بـوونی هـەبووە کـە داسـتانەکەیان بـۆ یـەك گێڕاوەتەوە، واتە مامەڵەکە دوالیزمـەیی بـوو، بێجگـە لـە مامەڵـەی مـرۆڤ لەگـەڵ خوا مامەڵەی نێوان موراد و مورید بـوونی هـەبوو، موریـد خەوشـەکانی خـۆی و عەیبەکانی خۆی بۆ مورادەکەی خۆی دەگێڕایەوە، شـێخەکەش چارەسـەرەکانی ئەوی، شوێنی ئەوی لەناو داستانەکەدا دیاری دەکرد، تۆ لە چ مەقامێکدای؟ لـە چ حاڵەتێکدایت؟ پێی ڕێنموونی دەکرد کـە کەوتۆتـە کـوێی داسـتانەکەوە. ئـەم تەریقانـە ئـەمڕۆ نـاتوانن ئـەم ڕۆڵـەیان ببێـت بۆیـە ئێسـتە جـارێکی تـر بابەتـە مەعنەوییـەکان کـە خـەریکی داڕشـتنەوەی خۆیـانن جـارێکی کـە لـە ڕێگـەی

ڕیوایەتـــەوە دەســـتیان پێکردۆتـــەوە. بۆیـــە دەبیـــنین مەســـەلەن ڕۆمانـــە مەعنەوییەکان لە ئاستی جیهانیدا پڕفرۆشترین ڕۆمانە جیهانییـەکانن، مەسـەلەن پــاولۆ کۆیلـۆ بەچـی ئەوەنـدە بەناوبانگـە بـۆ ئـەم بابەتـە، ئـەم ڕیوایەتانـە دەگێڕێتەوە، تەنانەت داستانە عەبەسییە ڕۆحیەکانی وەکو کامۆ و ئەوانە کە بـە پێغەمبـەرەکانی ئـەو سـەردەمە ناوزەنـد دەکـرێن، جـارێکی دیکـە ئـەو بابەتـە مەعنەوییانە ئەگێڕنـەوە و دەیانخەنـە سـەنتەر، شـیعرەکانی مـەولانا جەلالـەدین کە لە ئاستی جیهاندا ئەفرۆشرێن، جارێکی کە ئەم ڕیوایەتانە دروست ئەکەنـەوە ئەگەر ئێمە سەرکەوتوو بین لەوەی کە جارێکی کـە ئـەم داسـتانە بنووسـینەوە، یەعنی چییەتی بخەینەوە جێگـەی وجـود، داسـتانی وجـود بەلامانـەوە جێگـەی خودی وجود بگرێتەوە، لەم سەردەمەیا بە بۆچـوونی مـن جـارێکی کـە ئـەکرێت نالی و مەحوی و مەولەوی و ئەوانە دروست بکات، با ئەوەمان لە بیربچـێت نـالی و مـەحوی و مەولـەوی ئەگـەر دیوەکـە کۆمەڵایەتییەکـەی لـێ دەرکـەی کـە هەرکامێکیان خەلیفـەبوون و ناوبانگیـان هـەبووە و مەلایـەکی بـەناوبانگ بـوون، زانایەکی گەورە بوون لە ڕووی شیعرەوە لە سەردەمەکانی خۆیاندا وەکو هەموو شاعیرەکانی ئەم سەردەمە بەناوبانگ بوون.

ڕەنگە ئێستە ئێمـە شـاعیری گـەورەمان هـەبێت لای خـەڵك جێگـەی گرنگـی پێدان نەبێ یان بۆ نموونە ڕۆماننوسی گەورەمان هەبێت، ئێستە لە بـەر ئـەوەی لە ئاستە جیهانییەکە چونکە نەناسراوە ڕەنگە حسابی بۆ نـەکرێ، بـەڵام ئەگـەر ئـەم داسـتانە دروسـت بوویـەوە کـە ڕووگـە بـە ژیـانی مرۆڤـەکان ئەبەخشـێ بـە بۆچوونی من ئەمانەش گرنگی پەیدا بکەنەوە ئەو کاتە ئەکرێ جارێکی کـە ئێمـە

شاعیری گەورە لە ناوماندا دروست بێتەوە، لەم سەردەمەشدا بەڵام بە مەرجێك داستانێك بنووسینەوە کە گونجاوبێت لەگەڵ ئەم سەردەمەدا.

**موسعەب ئەدهەم: کەواتە بابەتی عیشق و عیرفان و مەعنەوییەت یان ئەو جوانبینی و ناسکییەی کە لەم ئەدەبیاتی ڕۆحی و مەعنەوییە هەیە و بە پێچەوانەوە کە لە ئێستادا هەستی پێناکرێت و ئەو گەرموگوڕییە هەر پەیوەندی بەو بابەتی وجود و ماهییەتەوە هەیە؟**

تەحسین حەمەغەریب: ستراکچەری یان بناغەی ئەو قۆناغە لێرەدا بوونی نییە لە بەر ئەوە تۆ ناتوانی لە هەستی جوانی و ناسکی ئەو قۆناغە تێبگەی و وەکو ئەو قۆناغەش ئافراندن بکەیت.

**موسعەب ئەدهەم: چی وایکردووە دەقێکی کلاسیك خوێندنەوەی زیاتر هەڵبگرێت یان ئەکرێت بە چەند خوێندنەوەیەك وەکو دەوترێت بیخوێنینەوە جا خوێندنەوەی مرۆڤانە بێت، مرۆڤ گەراییانە بێت یان ئایینیانە بێت یان نەتەوەییانە بێت، بەکورتی ئەوەی کە دەکرێت ئێستا لای نادینییەکان ئەو خوێندنەوەیە کە خۆیان دەیکەن خوێندنەوەیەکی نادینییانە یان نەتەوایەتی بێت، بە پێچەوانەی ئەمە دەکرێت خوێندنەوەی دینی و ڕۆحی و عیرفانیانە بۆ هەمان دەق بکرێت، لە کاتێکدا دەقی ئێستا ناکرێ ئەو هەموو خوێندنەوەیەی بۆ بکرێت یان ئەو هەموو خوێندنەوانە هەڵنەگرێت؟**

تەحسین حەمەغەریب: خۆی لە ڕاستیدا خەڵکی ورد هە یە لە ئەدەبیاتی کۆنی پێش مۆدێرنە هەر لای نەتەوەی کورد نا بەڵکو لای نەتەوەی دیکەش تەنانەت لای ڕۆژاواییەکانیش بە بۆچوونی من خاڵێکی سەنتەر هەیە لەو

بابەتەدا کە جەنابت ئاماژەت پێکرد، ئەویش ئەوەیە ئەدەبیاتی قۆناغی پێشوو ئەدەبیاتی هاوبەشە، یەعنی ئەدەبیاتێکە پێچەوانەیە لەگەڵ ئەدەبیاتی نوێ کە ئەدەبیاتی تاکە، نووسەری نوێ باسی خۆی دەکات بەڵام نووسەری قۆناغی پێشوو ئەگەر باسێکی ئەزموونی خۆشی بکات باسی ئەو ئەزموونە دەکات کە هاوبەشی نێوان ئەو و مرۆڤەکانی دیکەیە، یانی سروشتی هاوبەشی نێوان مرۆڤەکان باس دەکات. شکسپیر بۆچی ئێستا گرنگە؟ چونکە شکسپیر باسی خۆی ناکات باس لە سروشتی هاوبەشی نێوان مرۆڤەکان دەکات، سروشتی مرۆڤ، تەبیعەتی مرۆڤ سەنتەرە، بۆیە دواتریش کەسێکی وەکو فرۆید دێت دەڵێت: من هەموو شتەکانم لە شکسپیر وەرگرتووە، تەبیعەتی مرۆڤم لەوێ کەشفکردووە. لە ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵاتیشدا بە تایبەتیش لە ئەدەبیاتی عیرفانیدا سروشتی هاوبەشی مرۆڤەکان باس دەکات ئەگەرچی ئەزموونەکە تاکییە، هەربۆیە ئەدیبێکی کورد، شاعیرێکی کورد کە شیعر دەنوسێت خۆی لە عارفێکی کوردی ناو عیرفانی فارسی دەبینێتەوە، یان خۆی لە عیرفانی عەرەبیدا دەبینێتەوە. واتە سروشتێکی هاوبەش لە نێوانیاندا هەیە بۆیە زۆر بە ئاسانی مەولەوی زوو دەچێتە سەر خەتی مەولانا جەلالەدین، مەحوی زۆر بە ئاسانی دەچێتە خەتی مەسەلەن حافزی شیرازی، بۆیە باس باسی تاك نییە باسی سروشتی هاوبەشە، ئەم سروشتە هاوبەشەش لە نێوان هەموو مرۆڤەکاندا هەیە. ئەگەر بڵێین سروشتی هاوبەش بوونی هەیە کە ئەوان پێشگریمانەیان وابووە بوونی هەبووە، لەبەر ئەوەبووە داستانی هاوبەشیش لە نێوان مرۆڤەکاندا بوونی هەبووە، بەڵام بە ڕیوایەتی جیاجیا. ئەو سروشتە هاوبەشە

ڕیوایەتــە کوردییەکــەی مەولــەوی تــاوەگۆزی دروســتکردووە، ڕیوایەتــە فارســییەکەی حــافزی شــیرازی دروســتکردووە، ڕیوایەتــە ئینگلیزییەکــەی شکسـپیری دروسـتکردووە. مەبەسـتم ئەوەیـە خـودی سروشـتەکە هـەمان سروشـتە، بـەڵام ڕیوایـەتی جیاجیـا و خوێندنـەوەی جیـا و چـێژی جیاجیـا بـۆ هەمان شت دروستبووە، بۆیە دەکرێت من هەمان داسـتان بـاس بکـەم بـەڵام لـە زمانی خۆمەوە و تۆش لە زمانی خۆتەوە، تۆ خۆتی تێدا دەبینیتەوە، ئەوی تـر خۆی تێدا دەبینێتەوە، بە پێچەوانەوە ئەمـە وا دەکـات ئـەدەبیات لـە قۆنـاغی پێشوو هەرچی لە بابـەتێکی ئۆبجێکتیڤـەوە یـان دەرەکییـەوە بگوازرێتـەوە بـۆ بابەتێکی ناوەکی هاوبەش لە نێوان مرۆڤەکانـدا کـە هـەرکامێکیان باسـی خـۆی دەکات و وا ئەزانێت باسی ئەوی تریان دەکات، بەڵام ئێسـتە ئـەدەبیات چـونکە تاکییە و باسی سروشتی هاوبەش نییە، بۆیە مرۆڤەکان خۆیان لـەو ئەدەبیاتـەدا نابیننەوە، من نووسینەکەی تۆ ئەزانم باسی تۆ دەکات باسی مـن ناکـات، لەبـەر ئەوە من دەمەوێت تـۆی تێـدا بخوێنمـەوە، خـۆمی تێـدا نابینمـەوە، بۆیـە ئەمـە پانتاییەکەی کەمتر دەکاتەوە. واتـە تەنانـەت لـە فەلسـەفەی ئەخلاقیشـدا هـەتا ڕێسای ئەخلاقی هاوبەشتر بێت لە نێوان مرۆڤەکاندا پێگە و گرنگی زیاتر پەیـدا دەکات، لـە ئەدەبیاتیشـدا بـە هـەمان شـێوەیە، واتـە ئـەدەبیات ڕاسـتە دەبێـت ئەدەبیاتێکی لۆکاڵی بێت بەڵام دەبێـت داسـتانی هـەموو مرۆڤایـەتی بگێڕێتـەوە ئینجا دەبێتە ئەدەبیاتێکی جیهـانی. ئینجـا ئێسـتا کـام ئەدیبـە نـۆبڵی جیهـانی وەردەگرێت؟ ئەو کەسە کە لە زمانی نەتەوەکەی خۆیەوە، لە زمانی ناوچـەکەی خۆیـەوە داسـتانی هـەموو مرۆڤایـەتی بـاس کـردووە. هەرچـی زیـاتر ئـەدەبیات

سروشتی مرۆڤ کەشفتر بکات، جیهانی ڕاستەقینە کەشفتر بکات، ئەوا ئەوەندە زیاتر جیهانیتر دەبێت، ئەوەندە زیاتر خوێنەری بۆ زۆرتر دەبێت، چەند لۆکالّیتر، چەند کەسیتر بوو ئەوەندە مرۆڤەکان هەستدەکەن لەوان دورتر دەکەوێتەوە، کەمتر خوێندنەوەی بۆ دەکرێت.

**موسعەب ئەدهەم: بە بۆچوونی بەڕێزتان میتۆدی مامەڵەکردنی ئێمە لەگەڵ ئەدەبیاتدا یان ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردی دەبێت چ میتۆدیك بێت و چۆن بێت؟**

تەحسین حەمەغەریب: هەروەکو چۆن وتم هەمیشە بە شێوەیەکی تەریب دوو جۆر ئەدەبیات هاتووە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بە تایبەتیش ئەوە لە وڵاتی ئێمەدا زۆر باش دەردەکەوێت، هەرکام لەم دوو ئەدەبیاتە میتۆدی تایبەت بە خۆیان هەیە کە هەرکامێکیان جیاوازە، واتە کاتێك تۆ مامەڵە لەگەڵ ئەدەبیاتی دونیاییدا دەکەیت ئەو میتۆدانە بەکاردەهێنیت کە تایبەتن بەو دونیایەی خۆی. بۆ نموونە ئێستا لە خۆڕانییە لەو ئەدەبیاتەی کە پێی دەڵێن ئەدەبیاتی مۆدێرن ڕەخنەی تایبەت بە خۆی دروستدەکات و خوێندنەوەی ئەدەبی تایبەت بە خۆی دروستدەکات، میتۆدی تایبەت بە خۆی دروستدەکات، لە سەرەتاوە نووسەر دەمرێت پاشان خوێنەریش دەمرێت، ئەمە دەبێتە چێژ کە دەیبینین لە (ڕولان بارت)دا دەگاتە لوتکە. لەولاشەوە ئەدەبیاتی مەعنەویش میتۆدی تایبەت بە خۆی هەیە، لێرەدا گەورەترین کێشە، گەورەترین مامەڵەی نا لۆجیکی ئەوەیە کە میتۆدی هەرکام لەم ئەدەبیاتانە بۆ ئەویتر بەکار بهێنیت. ئەوەی کە ئێمە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم تا شەستەکان و حەفتاکان

بە حساب مێژوونووسانی ئەدەبی کوردی، ڕەخنەگرانی ئەدەبی کوردی کە زۆربەیان دەرچووی قوتابخانە ڕوسییەکەن وە گۆشکراون بە فیکری ئیشتراکی، دێن ئەدەبیاتی کلاسیکی ئێمە دەخوێننەوە لە کاتێکدا خۆیان سەر بە ئەدەبیاتە دونیاییەکەن، دەبینین بە ئامرازەکانی خۆیان ئەو ئەدەبیانە دەخوێننەوە و لەبری ئەوەی مەعنەوییەت لای مەولەوی تاوەگۆزی ببینن دڵداری بۆ ڕەگەزی بەرامبەر لەوێ دەبینن، لەبری ئەوەی مەعنەوییەت لای نالی ببینن خۆشەویستی نالی، دونیایی بوونی نالی بۆ حەبیبە دەبینن. ئا لێرەوە دەبینین زۆرتر میتۆدەکان کە بۆ ئەو ئەدەبیاتە ناشێت، چاویلکەیەکە کە بەکاری دەهێنن ئیتر ناپێکن، بە بۆچوونی من ئەوە عەنتیکەیە. ئەوە لە فەلسەفەشدا بەهەمان شێوەیە، لە زانستیشدا بەهەمان شێوەیە، ئێستە خۆی کێشاوەتە ناو زانستی پزیشکیشەوە. لە ڕاستیدا واتە ئێستە خەڵك هەیە باسی ئەزموونە ئاینییەکان دەکەن لە ڕێگەکانی لێکۆڵینەوە لە کۆئەندامی دەمارەوە کە گوایە بەخشینی دەرمانە چالاککەرەوەکان یان بێهوشکەرەکان بە مرۆڤ دەتوانێت ئەزموونی دینی بۆ دروست ببێت. ئەمە بەکارهێنانی بوارە دونیاییەکەیە بۆ ئەو بابەتە، لەبەرامبەر ئەوەشدا فەلسەفەیەکی دیاردەناسیانەی دینییانە هەیە کە بابەتەکان بەتەواو ڕۆحی دەخوێنێتەوە، بە بۆچوونی من لوتکەی ئەمە لە (پۆڵ ریکورد)دایە کە فەلسەفەی دیاردەناسییانەی مەعنەوییانە بەکاردەهینێت بۆ خوێندنەوەی بابەتەکان، ئەمە لە ئەدەبیاتیشدا هەر وایە، دەبێت ئەدەبیاتی عیرفانی لە ڕێگەی میتۆدی عیرفانی و دیاردەناسییانەی خۆی خوێندنەوەی بۆ بکرێت کە من لە وتارێکدا بە

ناوی شەوێك پێش سەفەر ویستومە ئەم میتۆدەی تایبەتە بە ئەدەبیاتی عیرفانییەوە دەرگایەکی بۆ بکەمەوە، لە ئەدەبیاتی کلاسیکیدا لە ڕاستیدا دەتوانین بڵێین عیرفانی نەزەری، ئیشی ئەمە بووە ئەدەبیاتی مەعنەوی خوێندۆتەوە. بۆ نموونە ئەو میتۆدەی کە کەسێکی وەکو (ئیبن عەرەبی) دایناوە، لەبەرامبەر ئەوە ئەدەبیاتێکی دونیایی هەیە کە ئەویش میتۆدی تایبەت بە خۆی هەیە، کێشەکە لەوەدایە کە بە میتۆدی هەریەکێکیان جیهانی ئەویتر بخوێنیتەوە.

**موسعەب ئەدهەم: پەیامی عاریفان و ئەدیبانمان، کە لە هەمانکاتدا دەکرێت بڵێین هەم عاریف بوون هەم ئەدیب، بۆ ئێمە چییە لە سەردەمی نوێدا؟**

تەحسین حەمەغەریب: لە ڕاستیدا ئەم پەیامەی ئەوان باسی سروشتی هاوبەشی نێوان مرۆڤەکان دەکات، بۆ هەموو مرۆڤایەتییە لە هەموو قۆناغەکاندا، بەڵام لەبەر ئەوەی کە لە هەموو سەردەمێکدا جێگەی ببێتەوە خۆی پێچاوە بە بابەتەکانی ئەو قۆناغەوە، بە کلتورەکانی ئەو قۆناغەوە. ئەم پەیامانە پەیامی زیندوون تا قیامەت وەك (مارتن لیگین) دەڵێت مەوج دەدەن، بەڵام بە مەرجێك ئێمە بتوانین ئەم پەیامە جیهانیانە کە ڕۆح زیندوو دەکەنەوە لەگەڵ کلتوری ئێمەدا بگونجێت. ئەمەیە ئێستە زۆرێك لە نووسەرەکان دەڵێن مەعنەوییەت جێگەی عیرفان بگرێتەوە، مەعنەوییەت واتە هەر هەمان پەیامەکانی قۆناغەکانی پێشوو، بەڵام بە کلتوری ئەمڕۆ. ئەم پەیامە کە لە بنەڕەتدا پەیامێکی ڕۆحی قووڵە دەبێت ببەسترێتەوە بە کلتوری ئەم قۆناغەوە، کلتوری ئەم قۆناغە پیشانمان باتەوە کە لە ئەساسدا ئەمەیە کە

دەرکەوتەی لە هەموو بوارەکانی تردا هەیە، ئەمە هونەری تایبەت بە خۆی دەخولقێنێت، وە ئەخلاقی تایبەت بە خۆی دەخولقێنێت، بۆیە مەولەوەی دەفەرمێت (هەرکەسێك پڕ بوو لە عیشق بە تەواوی ئەخلاقی پاك دەبێتەوە)، واتە جێکەوتەی ئەخلاقی بۆ خۆی دەخولقێنێت، واتە ئەدەبیاتی تایبەت بە خۆی دەخولقێنێت. من ئەوە دەبینم، وەرچەرخانێکی گەورە دێتەبەر چاوم. لەبەرئەوە ئەو پێشبینییەی کە لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستدا دەکرا کە سەدەی بیست و یەك سەدەی دینەکانە، ئێستا ئەگەر ئەم قسەیە پوختەتر بکرێت ئەکرێت بڵێین ئەم سەدەیە سەدەی مەعنەوییەتە، مەعنەوییەتێك کە لەگەڵ ئەم قۆناغەدا دەگونجێت لە هەموو بوارەکاندا، بە بەکارهێنانی وەسیلە ئەدەبیەکانی ئەو قۆناغە وەك هەموو ئەو شتانەی کە لەم قۆناغەدا بوونی هەیە، ئیدی لە فیلمەوە بیگرە تا ڕۆمان و موسیقا وە شتەکانی تر. دەبینین ئەو هونەرمەندانە زۆرتر ڕەواج پەیدا دەکەن کە ئەم بابەتە مەعنەوییانە دەڵێنەوە، ئیتر باس نییە کە شەخسەکە بۆخۆی مەعنەوییەت گەرایە یان نا. ئەو ڕۆمانە جیهانیانە ڕەواج پەیدا دەکەن کە ئەم جۆرە ئەدەبیاتە دەڵێنەوە، بۆ نموونە لە ناو هونەری کوردیدا بۆچی (عەدنان کەریم) یان (بەهجەت یەحیا) ئەم ناوبانگەیان هەیە؟ بە بۆچوونی من ئەم بابەتەیە، ئەو فەراغەیە کە هەستپێکراوە لە بوارەدا و ئەوان پڕیان کردۆتەوە. تەنانەت لە ئەدەبە دونیاییەکەشدا ئەو کتێبانە زۆرتر شوێنی خۆیان دەگرن کە ئەم پرسیارە مەعنەوییانەیان هەیە، ئاخر خۆ مەعنەوییەت تەنیا دەرئەنجام نییە، تەنیا وەڵام نییە بەڵکو پرسیاریشە، واتە مەعنەوییەت تەنیا لە وەڵامدا فریای مرۆڤ

ناکەوێت کە ئەمە ئیشە بچوکەکەی مەعنەوییەتـە، بـەڵکو مەعنەوییـەت دیـوێکی تریشی هەیە کە ئەویش ئەوەیە کە پرسیار دەخولقێنێت. ئا لێرەدایـە (حـافیزی شیرازی) دەفەرموێت: ئەم جۆرە پرسیارانە لە شافیعی مەکەن، چونکە شافیعی وەڵامی پێ نییە. لە کاتێکدا عیشق خۆی بۆخۆی پرسـیارخولقێنە، مەعنەوییـەت پرسیار خولقێنە کە مرۆڤی ئەم سـەردەمە هێنـدەی پێویسـتی بـە پرسـیارەکانە هێنـدە پێویسـتی بـە وەڵامـەکان نییـە. دەبیـنین مەعنەوییـەت لـەم قۆناغـەدا گەورەترین ڕۆڵی دەبێت وە لە داهاتوشدا. ئێمە لە (پڕۆژەی هەژان) دەرکی ئـەو بابەتە دەکەین کە یەکێك لە خاڵە بەهێزەکانی ئێمـە ئەوەیـە جیـاواز لـەو پـڕۆژە دینییانـەی تـر کـە لـە کۆمەڵگـەی ئێمـەدا کـراون و دەکـرێن، ئەوەیـە کـە ئێمـە جـەختمان لەسـەر ئـەم بابەتـە مەعنەوییانەیـە، بۆیـە فەلسـەفە دەخـولقێنین، ئەدەب دەخولقێنین، دەقی ئەدەبی دەنووسین وە هەم مۆسیقا و هونـەر لەگـەڵ ئێمەدا دێتەوە. بۆیە ئەم سەردەمە سەردەمی گەڕانەوەیە بۆ مەعنەوییەت.

# شیعر و عەشق ڕەنگە لە ناوەڕۆکدا یەکشتبووبێ

## گفتوگۆ لەگەڵ "ئەحمەدی مەلا"

**موسعەب ئەدهەم: ئەو هەموو عیشق و گەرموگوڕییەی کە لە ئەدەبیاتی کلاسیکدا هەستی پێ دەکرێت لە چییەوە سەرچاوەی گرتووە؟**

ئەحمەدی مەلا: عیشق لە شیعری کلاسیکی کوردی لە سەر سنوورەکانی عیشقێکی موتەسەویفانە و عەشقی زیهنیدا خۆی دەخەملێنێ. ئەم هاتوچۆیە لەم نێوەندە لە ئەدەبیاتی ئەورووپیشدا بەرچاو دەکەوێت. بە تایبەت لە سەردەمی ڕاپەڕینی ئیتالی و فەڕەنسی، ئایدییەکانی ئاسمان بۆ سەرزەمین شۆڕدەکرێنەوە. لە ئەدەبیاتی ئیتالی لە لای "دانتێ" و "پێترارك" سەرهەڵدەدات و لە لای فەڕەنسییەکانیش لە نێو گرووپی "دو لا پلایاد"، بە تایبەت لای "دو بلێ" و "پیار ڕۆنسار". عەشق تێمە و بابەتێکی گەردوونییە کە تێکەڵ بە شیعر دەبێت، شیعر و عەشق ڕەنگە لە ناوەڕۆکدا یەك شت بووبێتن. هەندێجار عەشقی ژنێك شکستی هێناوە و بووە بە عەشقی یەزدانی، هەندێجاریش عیشقی یەزدان بە کەرەسەکانی عیشقی دونییەوی گوزارشتی لێکراوە. لای "مەحوی" ئەمە ڕوو دەدات، ئەو خودایەی ئەو شیعری بۆ دەنووسێت ئەندرۆژینە،

واتە دوو ڕەگە. لە هەمان کاتدا مێیە، لە هەمان کاتیشدا نێرە. هەروەها "سرووتی سرووتەکان"ی تەورات یەکێکە لە نموونە مێژووییەکان. عیشق تایبەتمەندییەك نییە لە شیعری کلاسیکی، بەڵکو تا ڕۆژی ئیمڕۆشمان ئەم ئاوێتەبوونە لە ئارادایە، بەڵام شێوازەکانی دەربڕین و وێنە شیعرییەکان و زمان و ئاستەکانی ئەم گوزارشتلێکردنە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە.

**موسعەب ئەدهەم: زیندوێتی ئەدەبیات و شیعری کلاسیکی کوردی لە سەردەمەکانی پێشوودا بۆچی دەگەڕێتەوە؟**

ئەحمەدی مەلا: شیعری کلاسیکی کوردی خاوەن هەمان پێوەری شیعری کلاسیکی فەرەنسی نییە، دەبێ بە وردی ئەم تێرمە، یا ئەم دەستەواژەیە بەکاربهێنین. کلاسیسزمی فەرەنسی لە نێو مێژوویيەکی تایبەتدا سەرهەڵدەدات، لەو سەردەمەی کە تێرمی "ژەنتی ئۆم" گەشە دەکات، کۆشکی پاشایەتی دەبێتە مەڵبەندێکی گرینگ بۆ چالاکییە ئەدەبییەکان، پەیوەندییەکی نوێ لە نێوان ئەدەب و خەڵك پەیدا دەبێ و ئەرکێکی کۆمەڵایەتی هەیە و دواجار دەبێ سەرجەم دەستوور و یاساکانی ئەم ئەدەبە لەبەرچاو بگیرێت. لەم ڕووەوە، لەو سەردەمە، "بوالۆ" کتێبێك بە ناوی هونەری شیعریەت دەنووسێ و سەرجەم ئەو دەستوورانە بەیان دەکات کە دەبێ بەرهەمێکی کلاسیکی لەبەر بنووسرێتەوە. بەڵام شیعری کلاسیکی کوردی، دەکرێ بە شیعری "حوجرە" نێوزەد بکرێت،

شیعرێکی لە نێو توێژێکی کۆمەڵایەتی زۆر بەرتەسکدا بڵاودەبووەوە. هۆکارەکانیش زۆرن، نەبوونی چاپەمەنی لەو سەردەمە، نەخوێندەواری، نەبوونی قوتابخانەی حکومەتی، یا قوتابخانەی مەدەنی. بۆیە ئەدەب وەکو پاشکۆی مزگەوت دێتە ئاراوە، هەموو بکەرەکانی دەرچووی حوجرەن، واتە هەموویان عەمامە لەسەرن. دەستوورەکانی عەرووز بەکاردەهێنرێت و دەتوانین بڵێین تا ڕادەیەکی زۆریش شیعرێکی زیهنییە. شیعر لە مێژووی کورد وەکو یادگەیەك دەبێ تەماشا بکرێت، چونکە هەڵگری ڕۆحی نەتەوەیە، ئەویش زمانە. ئەگەر شیعر لە مێژووی کورد بهێنینە دەرەوە، هیچی دیکەمان بۆ نامێنێتەوە. ئێمە وەکو عەرەب نین خاوەن قورئان بین، ئێمە وەکو تورك و فارسەکانیش نین خاوەن ئیمپراتۆریەت بووبێتین، واتە خاوەن دەسەڵات بووبێتین، ئێمە وڵاتێکی وەکو فەڕەنساش نین هەر لە سەدەی پانزە و شانزەوە هۆشیارێکی زمانەوانی سیاسی – زمانەوانی گەشەی کردبێ و سەنتەری سیاسی خۆی بۆ پەرەپێدانی ئەدەبیش تەرخان کردبێ. ئەمە جگە لە سەردەمی چاخەکانی ناوەند کە شارلمانی سەنتەرێکی کلتوری ئەوروپی دروست دەکات. بۆیە گرینگی دان بە شیعری کلاسیکی کوردی، وەکو گرینگی دانە بە ڕۆحی کوردی.

**موسعەب ئەدهەم: دەروونناس و بیرمەندی بەناوبانگ " ئەریك فرۆم" پێی وایە ئێمە کەسێکمان خۆش دەوێت لەبەرئەوەیە خۆمانی تێدا دەبینینەوە، پێت وانییە لەبەرئەوەی ئەدەبیاتی کلاسیك هێندە لە لامان بەرز و جوانە، چونکە خۆمانی تێدا دەبینینەوە؟ بۆچی ئەم ئاوێنەیە لەم سەردەمەدا بوونی نییە و گەر هەبێت بەراورد ناکرێت بە سەردەمی پێش مۆدێرنە؟ وەکو لە سەرەوە ئاماژەم پێی کرد.**

ئەحمەدی مەلا: لای ئێمە نەخوێندەوارانیش گوێیان لە "حاجی قادری کۆیی" بێت دەگەشێنەوە، هەست دەکەن بەشێکی ئۆرگانێکە لەو ڕۆحەی لەسەرەوە باسم کرد. ئەم ئاوێنەیە بۆ ڕۆژی ئیمڕۆ فراوانتر بووە، تەنها لە چەند شاعیرێك و چەند شیعرێکدا بەرجەستە نابێت، بەڵکو بە نێو سەرجەم کایەکان و چالاکییەکاندا بڵاوبۆتەوە: سیاسەت، دامەزراوە، ئەدەب، شانۆ، هونەری پلاستیکی، سینەما، میدیا، تەلەفزیۆن... هتد. من بڕوا ناکەم ئێمە لە سەردەمی مۆدێرنە بژین، ئێمە دەکەوینە قۆناغی "پێش مۆدێرن"ەوە. هەموو کەرەسەکانی مۆدێرنیتە لە هەرێمی کوردستان دەستدەکەوێت، بەڵام عەقڵییەت و پەیوەندییەکانمان لە سەر بناغەیەکی دی داڕێژراوە. بنەمای عەقڵییەتی کوردی هێشتا بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش ئاینییە، ئەم پەیوەندییە خۆی لە خۆیدا ڕێگرە لە سەرهەڵدانی مۆدێرنە.

**موسعەب ئەدهەم: عیشق و عیرفـان و مەعنەوییـەت لـە ئـەدەبیاتی کلاسیك دەچۆڕێت، بە جۆرێك ناتوانین باسی ئەدەبیاتی کوردی کلاسیك نەکەین گەر بێت و نووری عیرفان و مەعنەوییەت باس نەکەین، تەنانەت گەر پێشمان وابێت دەقەکان خوێندنەوەی عیرفانی و مەعنەوی هەڵناگرن، ئەوا هەر دەبێت ئەو ڕەهەندە فەرامۆش نەکەین؟**

ئەحمەدی مەلا: سەرچاوەی ئەدەب لای ئێمە سەرچاوەیەکی ئاینییـە، چونکە سەرجەم سەرچاوە مەعریفییەکان لـە ئایینـەوە، یـا لـە پـیرۆزەوە هەڵقوڵاون. شاعیر لە نێو ئەم ئاو و هەوایەدا سـەرهەڵدەدات، ئـەم هـەموو دراوانە وەکو بەشێکی دانەبڕاو سەیری دەکرێت. مێژووی فیکری کـوردی، مێژوویەکی ئەدەبییە، زیاتر وەکو لە مێژووییـەکی دیکـە بێـت. ئـەدەبیش شیعرە، واتە شیعر ئەم مێژووە پێکدەهێنێت، کـە بـوار بـۆ بیرکردنـەوەی ڕووت ناڕەخسێنێ کـە کەرەسـەکانی ئـەم بیرکردنەوەیە پەخشـانە. بۆیـە هەست بە گەشەسەندێکی فیکری ناکرێـت لـە نێـو ئـەم مێـژووە شـیعریە. شیعریش بە کەرەسـە ڕەوانبێژییـەکان دەنووسـرێنەوە: ڕەمـز و خـوازە و وێنە... هتد، هەموو ئەم ڕەگەزانە کۆواتایان هەیە، یا بە شێوەیەکی دی، لە یەك خوێندنەوە زیاتر هەڵدەگرن، بۆیە سنوورەکانی شیعری عیرفـان و پرۆفان دەکرێ لە زۆر ڕووەوە، لەو قۆناغەدا ئاوێتەی یەك بن.

**موسعەب ئەدهەم: بۆچی ئەدەبیات و نووسینی ئێستامان بە شێوەیەکی گشتی ئەو ناسکی و ڕۆحەی تێدا نابینرێت، گەر بوونیشی هەبێت هەوڵی تاکەکەسین و وەکو پرۆژەیەکی گەورە کاری لەسەر ناکرێت؟**

ئەحمەدی مەلا: سەرجەم بۆچوون و تێگەیشتنەکان لەمەڕ کاری ئەدەبییەوە گۆڕانکاری گەورەیان بەسەردا هاتووە. ئیمڕۆ ئافراندن کاری تاکەکەسە وەکو لە کارێکی دەستەجەمعی. نابێ ئیمڕۆ سەیری ئەدەب بکەین و چاوەڕوانی شتێکی لێبکەین کە تایبەت نەبێت بە ئەو. پرۆژەی گەورەی ئیمڕۆ لە ئەدەبدا نووسینی دەقێکە، شیعر بێت یا رۆمان، شانۆنامەیەك بێت یا هەر بەرهەمێکی دیکە، بەڵام ئێمە زۆرجار چاوەڕوانی شتێك لە ئەدەب دەکەین کە لە توانایدا نییە پێمانی ببەخشێ.

**موسعەب ئەدهەم: چی وایکردووە دەقێکی کلاسیك ئەو هەموو خوێندنەوەیە هەڵبگرێت، واتە دەشێ فرە خوێندنەوە بۆ دەقی شاعیرێك بکەین و لەگەڵ هەر خوێندنەوەیەکیشدا کۆمەڵێك گەوهەر و مرواریمان دەست بکەوێت، بەڵام ئەم فرە ڕەهەندییە بە گشتی لە دەقێکی نوێدا کە لەم سەردەمەدا نووسرا بێت نابینرێت و هەڵگری تەنها خوێندنەوەیەکە؟**

ئەحمەدی مەلا: بە ڕاستی هەموو دەقێکی ئەدەبی دەبێ دەقێکی کراوە بێت و کۆخوێندنەوە هەڵگرێت، بەڵام ئەو سەنعەتەی لە ئەدەبی

کلاسیکیدا هەیە، ئیمڕۆ بوونی نییە، بەڵام دەکرێ گەمە و یاری بە زمان بکرێت و خەلقی ئەدەبی پێ بکرێت، ئەمەش مەرج نییە هەمان کاری ئەوان دووبارە بکەینەوە، بەڵکو ئەو پەیوەندییانە بخەینەڕوو کە لەگەڵ زمان هەمانە. ئەمەش هەڵبەتە شارەزاییی زۆری دەوێ. شاعیری کلاسیکی بە شێوەیەکی جوداواز لە ئێستا دەقی شیعری دەنووسییەوە، ئەو وەکو پەیکەرتاشێك ئیشی دەکرد و بە ڕۆژ و دوو ڕۆژ دەقەکەی تەواو نەدەکرد.

**موسعەب ئەدهەم: لە بنەڕەتدا ئامانجی ئەدەبیات بە گشتی و شیعر بە تایبەتی لە ئێستا چییە و چ ئەرکێکی هەیە؟**

ئەحمەدی مەلا: بە ڕای من ئەرکی شیعر لە بنەڕەتدا دروستکردنی سیحر بووە، واتە شاعیر سیحرباز بووە، زمانەکەی بە جۆرێك دارشتووە کە ئەوانەی لەسەرووی ئەوەوەن لێی تێبگەن، واتە قسەیەك بوو ئاراستەی هێزێکی بالاکراوە. قسەی ساحیر قسەیەکی پیرۆز بووە، لێرەوە دەسەڵاتی زمان و دەسەڵاتی ئایینی هاوشان وەستاون. شاعیر کەسێکی ئاسایی نەبووە، بەڵکو جێی ڕێز و ستایش بووە، لە ئەڵقەی نزیکی دەسەڵات بووە، بەڵکو خودی خۆی دەسەڵاتێکی دیکەی هەبووە لە سەرووی هەموو دەسەڵاتەکان. زمانی ڕەمز و لوغز و پەنهانی بووە، بۆ ئەوەی ئینسان لەگەڵ دەرەوەی خۆی ئاشتکاتەوە، تەنانەت گەردوون هێورکاتەوە یا ڕووداوە پەدیدە ئامێزەکانی پێ ڕوون بکاتەوە، وەکو لای

گرێگی دێریندا هەبووە. هەڵبەتە ئەم ئەرکە خاوەن مێژووی خۆیەتی و ئەویش گۆڕانکاری بەسەردا دێ. هەموو پەیوەندی ئایینی ئیسلام و شاعیر دەزانین، دەیخاتە پەراوێزەوە و تەنانەت دەیەوێ شیعر و شاعیر دەستەمۆ بکات. پێغەمبەر خۆی چەکی دەستی زمان بوو، بۆیە ویستوێتی ئەم کایەیە تەنها بۆ خۆی بگەڕێنێتەوە. لە ڕژێمە تۆتولیتارییەکان وەکو نەیار سەیر دەکرێت. ئیمڕۆ شاعیر ئەو کائینە بێ خاوەنەیە کە کەس ئاوڕی لێناداتەوە و نە مەترسییە بۆ سەر دەسەڵاتەکان، نە دەسەڵاتیش پێویستی پێیەتی. شاعیر یەکێك لە هونەرمەندە پاکیزەکانی جیهان، چونکە ناچێتە خانەکانی کڕین و فرۆشتنەوە. ئەو یاخییەکە لە خودی خۆشی. نە چاوەڕێی زۆر شتی لێدەکرێ، نە بە تەواوی لە ناو دەچێت، بەڵام لە خودی هەموو یەکێکیش شاعیرێك هەیە.

**موسعەب ئەدهەم: جێکەوتی شیعرێکی عاریفێکی کورد نەك چەندین ساڵ، بەڵکو بۆ هەتاهەتایە دەمێنێت، ئەو شیعرە هەڵگری چ پەیامێکە ئەو جێککەوتەی دروستکردووە؟**

ئەحمەدی مەلا: هەموو میللەتێك بە چاوێکی نیمچە پیرۆزەوە سەیری بەشێك لە کەلەپووری خۆی دەکات، "سێرڤانتێس" لای ئیسپانییەکان، کەلەپووری فەلسەفی لای یۆنانی کۆن، "مۆلییەر" لای فەڕەنسییەکان، "دانتێ" لای ئیتالییەکان، "موتەنەبی" و شیعری جاهیلی لای عەرەب،

"فیردەوسی" لای فارس، ئێمەش شیعری کلاسیکی و عاریفانەمان هەیە، ئێمەش بە چاوێکی نیمچە پیرۆزەوە سەیری ئەو کەلەپوورە دەکەین.

**موسعەب ئەدهەم: ئەدەبیاتی کلاسیکیمان کە لە شیعردا بە زۆری بەرجەستە بووە، مانایەکی قووڵی تێدا شاردراوەتەوە، بۆچی لە ئەدەبیاتی نوێدا کەمتر دەق هەڵگری مانایە؟ ئەمەش جیا لەوەی "مانا" لە سەردەمی مۆدێرنەدا هەمان ئەو "مانا"یە نییە کە لەسەردەمی پێش مۆدێرنە و کۆندا بوونی هەبووە؟**

ئەحمەدی مەلا: مانا و شیعر دوو دەستەخوشکی نەیارن بە نیسبەت شیعری هاوچەرخەوە. شاعیر پەیوەندییەکی بزێوی لەگەڵ مانادا هەیە. شیعری نوێ سەنعەتی زمانەوانی بەسەرەوە دیار نییە، بەڵکو لە ڕێگای شیعرەوە شاعیر دەیەوێ پەیوەندییەکەی ڕاستەوخۆ، بێلەکە، بێگەرد، تەنانەت عەفەوی دروست بکات. شیعر نووسین لە پێناو دەرخستنی مانا شاراوەکانی بوون نییە، بەڵکو هەڵدانەوەی دیوەکانی دیکەی بوونە، هەڵدانەوەی توێژەکانێتی، گەڕانێکە بە دوای خودی شاعیر و زمانە. شاعیری هاوچەرخ ئەو گومڕایەیە کە هەندێجار لە سەر سنوورەکانی بێهوودەیی جێماندەهێڵێ، ئەو حیکمەتی ئەزەلی شک نابات، وانەی یەکەمی لە ژێر ڕکێفدا نییە. ئەو خودێك دەنووسێتەوە کە تاك بێت.

**موسعەب ئەدهەم: بۆچی وێنە و وێنەگەری تاکو ئاستی تەواو ڕووکەش لە دەقی نوێدا دەبینرێت، کەچی بە پێچەوانەوە ئەو وێنەیەی کە پێشتر بوونی هەیە و لە دەقی کلاسیکدا دەیبینین لەگەڵ ئەوەی وێنەشن، بەڵام قووڵترن و زیهن و بیرمان بۆ جێگای دیکە و پرسیاری دیکەی قـووڵی فیکری و فەلسەفی دەبەن؟**

ئەحمــەدی مــەلا: شــاعیری کلاســیکی وەکــو ســەنعەتکارەکانی ئــەو سەردەمە، ئیشی لەسەر زمان کردووە. بۆ نموونە: یەکێکی وەکـو "نـالی" بە شێوەیەکی عەفەوی شیعری نەنووسیوە، بەڵکو لـە سـەر موفرەدەکـان وەکـو ئاسـنگەرێك ئیشـی کـردووە، داغـی کـردووە، کوتـاوێتی، سـاردی کردۆتـەوە و دیسـانەوە نـەخش و نیگـاری لەسـەر دروسـتکردووە. بـەڵام سەنعەت بە بێ شاعیربوونیش دادی کەسی نەداوە، بۆیە دەبینین ئـەو لـە هـەمووان زیـاتر شـاعیرتر بـووە. هـەر قۆناغێـك دونیایەکـە بـۆ خـۆی، دۆزینەوەی نوێ، بۆچوونی نوێ، سەرهەڵدانی شتی نوێ، کاریگەریی خۆی لە سەر ئینسانەکان دروست دەکات، بۆیە نابێ ئێمە داوا لە کـەس بکـەین وەکو جاران دەق بنووسێ، ناکرێ بڵێین شیعری جاران بـەهێزتر بـووە لـە شیعری ئێمڕۆ، یا بـە پێچـەوانەوە. لـە هـەموو سـەردەمێك دەقـی کۆك و شاعیری گرینگ هەن. کەس کـەس ناسڕێتەوە و کـەس نابێتـە بارسـتایی بەسەر ئەوی دیکەوە. ئەمە نەك تەنها لە بواری شیعردا، بـەڵکو لـە بـواری

ڕۆمـان و شانۆنامەشـدا ڕاسـتە. شـانۆی "ئـەڤان گـارد"، "مۆلییـەر"ی نەسـرپییەوە، "یۆنیسـکۆ" و "بێکێـت" نـەیانتوانی شـانۆی "برێخـت" بسڕنەوە. بـەڵام بینـەری زەمـانی "شکسـپیر" و "مۆلییـەر" هـەمان ئـەو بینەرە نین کە لە سەردەمی جەنگی جیهانی دووەم و دواتر پەیدا دەبـن. ئەم پێوەرانە دەکرێ شیعر و ژانرەکانی دیکەی ئـەدەبی پـێ بپێـوی. مـن ڕۆڵەی ئەم سەردەمم و پەیوەندی من بۆ نموونە زۆر جیاوازە لە (پیرەمێرد و گۆران و شێرکۆ بێکەس). هەموویان خاوەن دەقی نایابن. بەڵام نابێ من بێم لاسایی ئەوان بکەمەوە، ئیشی ئەدەب ئەوەیە کە تـاك خـودی خـۆی بدۆزێتەوە، ئەم چەمکە نوێیە و دەبێ ئیشی زیاتری لە سەر بکرێ.

**موسـعەب ئەدهـەم: گـەر ڕووکـەش و ڕووکەشـکەرایی سـیفەتێکی سەردەمی نوێ بێت، ئەمەش قسە گەلێك لە بیرمەندەکانە لەمەڕ چییەتیی سەردەمی نوێ، ئایا ئێمە دەتوانین لە دەقی کلاسیك تێبگەین وەکـو ئەوەی کە پێویستە؟**

ئەحمەدی مەلا: ئێمـە لـە سـەردەمێکی زۆر جـەنجاڵ دەژیـن، بـە هـیچ شێوەیەك ڕووکەش و سادە نییە. گلۆبالیز، شەڕی جۆراجـۆر (نەتـەوەیی، ئایینی،... هتد) توندوتیژی و سەلەفییەتی جیهادی، چەمکە فاسییەکان، تەنگـژە ئابوورییـەکان، بێکـاری، ڕاگواسـتن و تەنگـژەکانی ناسـنامە، لـە ناوچـوونی زمـان و کـەلتوور، هەیمەنـەی سـەرمایەدارە زەبەلاحـەکان،

دەوڵەمەنـدبوونی چـەند کەسـانێك لـە دەوڵەتەکـەیان... هتـد). ئەمانـە و دەیـان تـوخمی دیکـەی دیکـە، کـە پێمـان دەڵـێ ئێمـە لەسـەردەمێکی مەترسیداردا دەژین. گوڵ و پەری و باخ و پەپوولە توێنێتمـان ناشـکێنێ، دەبـێ دەقێـك بنووسـین لـە ئاسـتی ئـەم جەنجاڵییـەدا بـێ، نـابێ ئـەوە فەرامۆش بکەین کە ئێمە نـەوەی ئـەم سـەردەمەین. تێگەیشـتن لـە دەق، کلاسیکی بێت یا نا، پێویسـتی بـە مێتـۆد هەیـە، مێتـۆدیش دەیـەوێ بـە چاوێکی زانستییانە بڕوانێتە بەرهەمێکی ئەدەبی، جا شیعر بێت یا نا. ئایا ئێمە لە "نالی" دەگەین؟ بە ڕای من ئەمە پرسیارێکی تەواو نییە، چونکە تێگەیشـتن مانـای چییە؟ تێگەیشـتن چ دەگەیـەنێ؟ ئەمانـەش پرسـیار گەلێکن دەبێ لە خۆمـانی بکـەین. لەبەرئـەوەی ئێمـە بەرامبـەر بـە کـاری هونەرین، نابێ هەموو ڕێگاکان لـە یـەك ڕێگـادا تەسـك بکەینـەوە، هـەموو ماناکانیش لە یەك مانادا. بەڵکو کاتێك دەقێك دەخوێنینەوە، لە چی ئـەو دەقـە دەگـەڕێین. هـەموو دەقێـك چـەندین ڕەهەنـدی هەیـە: زمانـەوانی، فۆنەتیك، ڕەوانبێژی کلاسیکی، کەلەپووری ئایینی، میتافیزیك، مەعریفەی سەردەم، چەمکە دەروونییەکان، مۆتیفەکان، کێش، سەروا... هتـد. هـەر ڕەگەزێك لەمانە، کاری جیدی دەوێ، هەر لێکۆڵینەوەیەکیش شتێك دەڵێ و هەندێجاریش پرسیاری نوێ دەوروژێنێ.

**موسعەب ئەدهەم: ئایا ئەو مامەڵەیەی کە هەندێك نووسەر و لێکۆڵەر دەیکەن (مامەڵەکردنێکی ڕووکەشییانە و خوێندنەوەیەکی مادییانە) لەتەك دەقە کۆن و کلاسیکییەکاندا مامەڵەیەکی دروستە و دەمانگەیێنێتە ئاسۆیەك بەرەوڕووی کردنەوەی وەلامی پرسیار و نهێنییەکانی دەقەکان؟ بە بۆچوونی بەڕێزتان میتۆدی مامەڵەکردنمان بۆ خوێندنەوەی دەقە کلاسیکی و شیعری شاعیرە مەزنەکانمان چی بێت؟**

ئەحمەدی مەلا: هەڵبژاردنی میتۆدی کارکردن پەیوەستە بە خەسڵەتی ئەو کارەی کە پێی هەڵدەستین. میتۆد لە کۆتاییدا، ڕێبازێکی کارکردنە بە شێوەیەکی زانستییانە، بەو واتایە کە پرەنسیپەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی دەبێ بە هەند وەرگیرێت. بەکارهێنانی زمانی لێکۆڵینەوە، بەکارهێنانی بیبلیۆگرافیا، هێنانەوەی نموونە و ئیستیشهاد، بەڵگە و ئەنجەتەکان، پرسیار ووروژاندن و دروستکردنی ئیشکالییەت و گریمان و... هتد. یەك میتۆدمان نییە، بۆیە دەکرێ چەندین میتۆد بەکاربهێنین، ئەمەش وەکو لە سەرەوە ئاماژەم بۆی کرد پەیوەستە بە ماهییەتی ئەو کارەی کە لێکۆڵەر پێی هەڵدەستێ.

د. ئەحمەدی مەلا، لە ساڵی ١٩٥٧ لە گوندی تۆمار، لە ناوچەی شوان لە کەرکوک لە دایك بووە. پۆلی یەکەمی سەرەتایی لە گوندی "گەڕەشێخان"، لە دەشتی هەولێر تەواو کردووە. قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی لە شاری کەرکوك تەواو کردووە. قوتابخانەی ئامادەیی لە بەغدا تەواو کردوە، لە ساڵی ١٩٨١ ەوە لە ئەوروپا دەژیت، چەند ساڵێك درامای بەشی شانۆی لە شاری ژنێڤ خوێندووە. کولێژی ئەدەبیات لە زانکۆی فرانش کۆنتێ تەواو کردووە. هەروەها ماستەری لە زانستی زمانەوانی، لە زانکۆی ناوبراو - دکتۆرای لە ئەدەبی بەراوردکاری لە فەڕەنسا تەواو کردووە - لە پاڵ شیعر، ڕۆمان و لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی دەنووسێ. بۆدلێر و ڕامبۆ و ئۆکتاڤیۆ پاسی تەرجەمەی کوردی کردووە. مەحوی تەرجەمەی فەڕەنسی کردووە و لە دەزگای ئارمەتان لە پاریس بڵاوبۆتەوە. ئێستا لە کۆلێژی ئەدەبیات، لە دانشگای سیوداد ریال لە ئیسپانیا مێژووی زمانی فەڕەنسی و ئەدەبیاتی چاخەکانی ناوەند و سەردەمی ڕاپەڕین دەڵێتەوە.

# هونەر و شیعر لەو شتانەن دەتوانن کەمێ لە ڕازەکانی عیشقمان بۆ بگێڕنەوە

گفتوگۆ لەگەڵ "نەبەز هەورامی"[1]

**موسعەب ئەدهەم: هەڵبەتە گەلێك پێناسە بۆ عیشق کراوە، پێناسەی ئێوە بۆ عیشق چییە؟**

نەبەز هەورامی: من وا دەزانم پێناسە بۆ ئەو شتانە دەکرێت کە بەرهەست و بەرجەستەن، پێناسە زێتر پێوەندی بە شتە زانستییەکانەوە هەیە ( هەمو جۆرە زانستەکان)، واتە ئەو شتانەی لای مرۆڤ زانراون یان زۆر مامەڵەی لەگەڵ کردوون، ئەگەر چی بۆ هێندێ لە وانەش پێناسە ناتوانێ بە چییەتی و ماهییەتی شتەکان وەك پێویست ئاشنامان بکات، بۆ نموونە ئێمە دەتوانین پێناسەی منداڵ بە پێی تەمەن بکەین، بەڵام ئەو پێناسەیە ناتوانێ دەرخەری ماهییەتی منداڵ و دونیا و خەون و خەیاڵی بێت. بە بۆچوونی منیش عیشق لەو چەمکانەیە وەك شتە پێناسە بۆکراوەکان پێناسە ناکرێت، نەك هەر پێناسە بەڵکو باسکردنی و جێکردنەوەی لە زمان و نووسین و وتاردا شتێکی ئاسان نییە، ئێمە دەتوانین مانای زمانی و قامووسی بۆ عیشق بکەین، بەڵام ئەمە عیشقمان

---

[1] - ئەم گفتوگۆیە بە هاوکاری (کاندێش قادر) ئەنجام دراوە.

پێ ناناسێنێ. زۆر شت هەن لە عیشقیش بچووکتر، ناتوانین پێناسەیان بکەین، یان گوزارشتیان لێبکەین. بۆ نموونە بۆنی گوڵ یان جوانییەکەی، تۆ هەر هێندە دەتوانی بڵێی گوڵەکە جوانە، یان بۆنی خۆشە، ئیدی ناتوانی بۆنخۆشی و جوانییەکەی بەرجەستە بکەی یان بینووسی، بۆ ئەوەی بتوانی هەست بە جوانی و بۆنخۆشیەکەی بکەی، دەبێ بۆنی ئاوێتەی هەناسەت بکەی، دەبێ ڕەنگ و ڕوخساری ئاوێتەی بینینت بکەی، واتە دەبێ لەگەڵیا جۆرێك لە خەڵوەتت هەبێت. عیشقیش وەك "ئیبن عەرەبی و مەولانای ڕۆمی" و عاریفانی دی باسیان کردووە، لەو چەمکانەیە دەبێ بچێژرێ ئەوجا هەستی پێبکرێت، تەنانەت ئاسانیش نییە کەسی عاشق بتوانێ گوزارشت لە عیشقەکەی بکات، مەگەر بە کەرەستەیەکی نێزیك لە دونیای ڕۆح وەك کەرەستەی شیعر. من وا دەزانم هونەر و شیعر لەو شتانەن دەتوانن کەمێ لە ڕازەکانی عیشقمان بۆ بگێڕنەوە، ئەویش کەمێك نەك هەمووی (وەك لە کتێبی بزووتن لە خولگەکانی عیشقدا لەو بارەوە دواوین)، چونکە ئەوەتا شاعیرەکان، شاعیرە بلیمەت و مەزنەکان هەمیشە هاواری ئەوەیان لێبەرزبۆتەوە کە نەیانتوانیوە مەستی خۆیان بە تەواوی لە شیعردا بەرجەستە بکەن، تەنانەت عیشق جۆریك لە وەجد و مەستی بۆ مرۆڤ دروست دەکات و لەو کاتانەدا شتانێك دەڵێت کە بە ڕواڵەت شتی نامۆ و نامەئلوفن یان پێیان

دەگوترێت شـەتەح، ئەوانـەش بـە ڕوونـی ڕازی عیشـق ناگێڕنـەوە. مـن وا دەزانم عیشق چەمکێکە بەر لە هەرچی پێوەندی بە دونیای ڕۆحەوە هەیـە و ڕۆحـیش جیهـانێکی پـڕ لـە راز و نهێنییـە، وەك ئـەم ئایەتـە ئامـاژەی پێدەکات) ﴿وَيَسألونَكَ عَن الرٌوحِ قُل الرٌُوحُ مِن أمرِ رَبَّي وَمَا أُوتِيتُم مٌن العِلمِ إلا قَليلاً﴾. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە هەست بە بـوونی ڕۆح نەکـەین لـە وجودماندا، مرۆڤەکان هەریەکەیان بە ئاستێ هەست بە بـوون و زینـدوێتی ڕۆحی خۆیان دەکەن. لـە ڕوانگـەی ئایینەکانـەوە مـرۆڤ لـە دوانـەی ڕۆح و جەستە خولقێنراوە، جەستە لە گڵەوەیە، ڕۆحیش لە ئاسمانەوە، خۆراك و ژینگەی جەستە لە گڵەوەیە و دوایش بۆ نێـو گـڵ دەگەڕێتـەوە، خـۆراك و ئاو و هـەوای ڕۆحـیش لـە ئاسمانـە و دوایـش بـۆ ئـەوێ دەگەڕێتـەوە (لـە نووسینێکی تایبەتدا زۆرتـر قسـەمان لەمـە کـردووە). ئەوانـەی دەکۆشـن کەشوهەوای ئاسمانیانە لەسەر زەویدا بۆ ڕۆحیان بخولقێنن، یان ڕۆحیـان بە بەرزاییی ئاسمان بگەیەنن، ئەمانە دەبن بـە خـاوەنی ڕۆحێکـی بێـدار و زیندوو، ئیدی ئەم ڕۆحانە دەتوانن جوان مامەڵە لەگـەڵ خـالیق و تـەواوی مەخلوقاتدا بکەن، یان دەتوانین بڵـێین ئـەم جـۆرە ڕۆحانـە بـەر جیلـوەی ناوە جوانەکانی خوداوەند دەکەون و بەوە ڕۆشن دەبنەوە، هەم خـالیقی خۆیان قووڵتر دەناسن هەم مەخلوقات، ئیدی ئەم ڕۆشنبوونەوە و جووڵـە ڕۆحی و ناسینە، بەرەبەرە لە گەورەبووندایە و دەبێت بە مەحەببـەت، تـا

دەبێت بە عیشق ﴿أشَدُّ حُبًّا لِلّهِ﴾. دەگوترێ عیشق لە قورئاندا ناوی نەبراوە، ئەوە ڕاستە بەڵام لە قورئاندا چەمکی (الحب)، (٨٨) جار هاتووە و هەروەها ﴿أشَدُّ حُبًّا لِلّهِ﴾ هاتووە کە دەشێ ئەوە مانای عیشق بگەیەنێ، ئینجا ئەم مەحەببتە قورئانییە بە دڵەوە پێوەست کراوە.

هێندێ کەس ئەوە دەکەن بە بەڵگە کە مادەم لە قورئاندا ناوی عیشق نەبراوە، ئیدی شتێکی نەویستراوە یان بەرانبەر بە خوداوەند نالایەقە، بەڵام خۆ لە قورئانیشدا وشەی (عەقیدە) نەهاتووە، کەچی لای زۆر لە زانایان و ئەوانەی خۆیان بە جێگرەوەی سەلەف دەزانن لەبری چەمکێکی قورئانی وەك (ئیمان) چەمکی (عەقیدە) بەکار براوە، لە کاتێکدا ئیمان خۆی تەفسیرکەری خۆشییەتی لە قورئاندا. لە دەرەوەی فەزای ئایینەکانیش مرۆڤ تا ڕادەیەك هەر دەتوانێ ڕۆحپەروەر و عاشق بێت، دەتوانێ مرۆڤ و سروشت و خاك بکات بە مەعشوقی خۆی، واتە ئەوانەش فەزای عاشقبوون دەخولقێنن، یان لە ڕێگەی ئەمانەوە کەسی عاشق بە مەعشوقی حەقیقی بگات کە خوداوەندە.

**موسعەب ئەدهەم: ئەم هەموو قسەکردنە لەسەر عیشق بۆ؟ گەورەیی ئەم چەمکە لە چیدایە؟**

نەبەز هەورامی: لەوەوەیە کە عیشق ژیانە، زیندوێتییە، سەوزبوونی هەمیشەییە، ژیان و زیندوێتی بە مانای چییەتی نەك ڕۆژ و ساڵ و

چەندێتی. عیشق جوانی بەخشە، ڕوانینی عاشقانە بینراوەکان جوان دەکات، سوهرابی سپێهری دەڵێت: "خانەخویێ پرسی جوان یانی چی؟ جوان یانی دەربڕینی عاشقانەی شێوەکان." عیشق لاوان پیردەکات (پیرێتیی کاملی)، پیرانیش لاو دەکاتەوە (لاوێتیی گوڕ و تین) دواجار عیشق گەورەترین ترس لە سەر ژیانمان دەڕەوێنێتەوە، ترس لە مەرگ، هەموو عاریفەکان مەرگ بە وەسڵ دەزانن. "مەحوی" بە ڕزگاربوونی دەزانێ، "سوهرابی سپێهری" وا دەزانێ مەرگ لە نێو ژیاندایە و نامەحرەم نییە. مەرگ لەگەڵ هێشووی ترێدا دێتە دەمەوە مەرگ جاری وا هەیە ڕێحانە ئەچنێ هەمووش ئەزانین کە سییەکانی لەززەت پڕ لە ئۆکسجینی مەرگ. هەروەها دەڵێت: "ئەگەر مەرگیش نەبوایە، دەستمان بە دووی شتێکدا هەر ئەگەڕا."

**موسعەب ئەدهەم: ئەو شتانەی کە ڕاز و نهێنیی زۆریان لە خۆگرتووە، دەبوو زۆریان لەبارەوە نەگوترایە!**

نەبەز هەورامی: نا بە پێچەوانەوە زۆریان لەسەر دەگوترێت، چونکە مرۆڤ عەودالی دۆزینەوە و کەشفکردنیانە، دونیای عیشق یان ڕۆح دونیایەکی گەورەیە دەبێ تەی بکەی، ئەم تەیکردنەش بەردەوام دەبێت بە کەرەستەی گێڕانەوە و گوتن. عیشق وا دەکات مرۆڤ هەست بە گەورەیی گەردوونی خۆی بکات، یان هەست بکات هەر مەخلوقێك

گەردوونێکە بۆخۆی، ئیدی تا بینین و شوهود فرەوانتر بێت سەرسامی و گوتن زۆرتر دەبێت، ئاخر سەرسامبوونیش ڕازی خۆی هەیە، گەورەیی عیشق لەوەوەیە دەبێت بە ئاوێنە بۆ گەورەیی خالیق و مەخلوقات.

**موسعەب ئەدهەم: عیشقی ڕاستەقینە تایبەتمەندی و سیفەتەکانی چین؟**

نەبەز هەورامی: من وا دەزانم عیشقی ڕاستەقینە، عیشقە بۆ خوداوەند، ئەگەر عیشق بە مانایەك بەرهەمی سەرسام بوون بێت بە جەماڵ و جوانی، جوانی مرۆڤ و مەخلوقات یان جوانی ئاکار، ئەدی خوداوەند سەرچاوەی هەموو جۆرە جوانییەکان نییە! بۆیە لای عاریفەکان بە تایبەت لای ( ئەبوسەعیدی کوڕی ئەبولخەیر) عاشقبوون بە جوانی مەخلوقات، ڕێگەی عاشقبوونە بە خوداوەند، وەك گوتم دواجار عیشقی خودایی، عیشقی مرۆڤ و سروشت و مەخلوقات و تەنانەت بەرد و دار و ئاژەڵیش بە دووی خۆیدا دەهێنێ، بڕوانە عاشق و عاریفە گەورەکانی وەك (ڕابیعەی عەدەوی و مەولانای ڕۆمی و حافیز و ئیبن عەرەبی و مەولەوی و مەحوی و... هتد) چ عیشقێکی قووڵ بۆ مرۆڤ و مەخلوقات لە هەناویاندا کڵپەی کردووە، تا ئاستی پەرۆشیی بۆ نەیاران و ناحەزانیشیان. عیشقی ڕاستینە شوعلەوەربوونە بە ناوەکانی خوداوەند، ئاوێتە بوونە پێیان، تا بەوە دەگات کە خوداوەند بفەرموێ (من دەبم بە

چاوی ئەو بەندەیەم کە پێی دەبینێ و بەو دەستەی پێی دەگرێ... تا کۆتایی فەرموودە قودسیەکە – لەمبارەیەوە نووسینی تایبەتمان ئامادەیە – کە ئەمەش پایەی بە وەلی بوونە، ئەولیای خودا لای خەڵکیش ئەولیان، خودا لە نێو خەڵکیشدا جاڕی خۆشەویستییان بۆ دەدات. وەك فەرموودە ئاماژەی پێدەکات. عیشقی ڕاستەقینە ئەوەیە، بۆ نموونە ڕابیعەی عەدەوی لە گوتەیەکیدا گوزارشتی لێکردووە کە پەیوەندی ئەو پەیوەندی خۆشەویستی و پێوەندی عاشقانەیە بە خوداوەندەوە نەك ترسی دۆزەخ یان تەمای بەهەشت. یان ئەوەیە کە "مەحوی" تەعبیری لێدەکات و دەفەرمۆیێت:

**تۆ کە دەرکەوتی مەپرسە چی بەسەر دێ جان و دڵ**

**حاڵەتی شەونم تەماشاکە بە وەقتی ڕۆژهەڵات**

یان دەڵێت:

**کە دڵ دەتوێتەوە بۆ تۆ دەکەی ئەو ڕۆژە تۆ بڕوا**

**کە خۆ دەرخەی وەکو خۆر دڵ وەکو شەونم لە خۆ بڕوا**

عیشق بزووتنە، بزووتنی خۆدۆزینەوە، بزووتن بەرە و جیهانی مەخلوقات و بزووتن بەرەو شوهود و نیزیکبوونەوە لە خوداوەند، "نالی" بە سەرکۆنەوە لە نەفسی دەپرسێ هەتا کەی حیرسی وێرانە و هەتا کەی بەرەو کابەی مەبەست بەڕێناکەوی" ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا..."

"مەحوی" وا دەزانێ دڵی ئەوی بەرەو مەعشوق بەجێهێشتووە و هیچ سۆراخیشی نازانێ. "بێخود" بە هەمان شێوە دڵی لێیتۆراوە بەرەو سالاری مەدینە. بۆ عیشقی زەمینیش، عیشقی ڕاستینە هەرجۆرێکە لە خۆ تواندنەوە لە بەرانبەردا، جۆرێك لە بێئارامی دەخولقێنێ، مرۆڤ هەست دەکات ئەو مرۆڤەی جاران نییە، هەست دەکات شتێك ئاوێتەی وجودی بووە کە لە ناوەوە دەیبزوێنێ و هەست بەو بزووتنەش دەکات. بێگومان ژیانی نێوان مرۆڤەکان بەبێ عیشق نابێت، لە نێوان دوو ڕەگەزەکەی مرۆڤدا پێوەندی عاشقانە دروست دەبێت، بەڵام مەرج نییە هەموو جۆرە پەیوەندییەك عیشق بێت، دەکرێ خۆشەویستی بێت، دەکرێ هەوەسبازی و مامەڵەی جەستەیی ڕووت بێت، دەشکرێ عیشق بێت، هەروەك دەشکرێ مرۆڤ عاشق بە خاك و زێد و بە مرۆڤایەتی ببێت، تەنانەت عاشقانەش مامەڵە لەگەڵ کاروپیشەکەیدا بکات. لە ژیانی ڕۆژگاری پێغەمبەر و خەلیفەکاندا (سەلامە خوایان لێبێت) عیشقی نێوان دوو ڕەگەز بووە، بە دروستیش زانراوە، وەك شتێکی خۆنەویستانە باسی لێکراوە، شتێك کە مرۆڤ لە ئاستیدا دەسەڵاتی نییە، بەڵام هەوەسبازی و مامەڵەی جەستەیی نەخوازراو بووە، هێندێ لە زانایان عیشقی ڕەگەزی بەرانبەریان بە نەخۆشی زانیوە، بێگومان عاریفەکانیش بە دەرد و نەخۆشییان زانیوە، بەڵام لای ئەمان دەردەکە دەردی ڕۆحە بە تایبەت بۆ

عیشـقی خـودایی، بـەڵام لای فەقیهـەکان دەشـێ نەخۆشـییەکە نەخۆشـی دەروونی بێت. زۆرجار ڕێکدەکەوێ ئەمجۆرە عیشقانەش بـبن بـە دەرگـای عیشقی ئیلاهی، وەك عیشقی داستانی "مەم و زین" یان عیشـقی "مـەلای جزیری" یان مەعشوقی زەمینی بە جیلوەی مەعشوقی ئاسمـانی بزانـرێ، کە "مەولەوی"، "عەنبەرخاتوونی" بەو جیلوەیە دەزانی. دواجار عیشـقی ڕاستینە زیندوو بوونە، ئاخر مەرج نییە زیندوویەك بە جەستە، بـەڕۆحیش زینـدوو بێـت، مـردووی زینـدوو زۆرن، هـەروەك زینـدووی مـردووش زۆرن، پێغەمبەران و عاریفانی گـەورە بـە جەسـتە مـردوون، بـەڵام بـە ئـەخلاق و ئاسەوار و پرشنگی ڕۆحی زیندوون و بـەردەوام ڕۆشـنایی بـۆ زینـدووەکان پـەرش دەکـەن. خـەڵکێکی زۆریـش لـە غـافڵان بەسـەر زینـدوون و لـە نێوماندان، بەڵام هێندەی مردووە زیندووەکان نەخشـیان بەسـەر ژیانـەوە دیار نییە.

**موسعەب ئەدهەم: چۆن بتوانین عاشق ببین؟**

نەبەز هـەورامی: مـرۆڤ خـۆی کەشـوهەوا یـان قابیلیـەتی ئـەوەی تێـدا خولقێنراوە کە بتوانێ عاشق ببێت. فـەزای ئـایین بـە گشـتی خولقێنـەری عیشـقە، لـە فـەزای ئایینیشـدا عیرفـان زێـتر بەرجەسـتەکەری عیشـقە، کاریگـەری پەیامـەکان بـەر لـە هەرچـی کاریگـەری ڕۆحـی بـووە (گوتمـان عیشق پەیوەندی ڕۆحییە)، کاریگەری قورئان بە پلەی یەکەم کاریگـەری

ڕۆحییە ﴿وَكَذَلِكَ أَوحَينَا إِلَيكَ رُوحًا مِّن أمرِنَا﴾ لەم ئایەتەدا قورئان بە ڕۆح ناوبراوە، هەروەها فریشتەی وەحیش لە چەند جێیەك بە (ڕۆح) ناو براوە، پێغەمبەریش (د.خ) لە خەڵوەتەکانیدا پێشتر ڕۆحی بۆ عاشقبوون ئامادە کراوە، فریشتەکان بە منداڵی دەروونی ئەویان شۆردووە و تیفتیفەیانداوە، ئیدی ئەویش دوایی دەستی کردووە بە لەرزاندنی پەیکەری مەعشوقە فریودەرەکان. کەواتە ئایین ڕێگەی عاشقبوونە، قووڵبوونەوە لە مرۆڤایەتی مرۆڤ و حیکمەتی ژیان ڕێگەی عاشقبوونە، ڕامانی قووڵ و خەڵوەتکردن لەگەڵ سروشت و جوانییەکانیدا، چوونە نێو دونیای ئەدەب و هونەر، ئاشنابوون بە ژیانی عاریف و عاشقە گەورەکان، ئەمانە هەموو ڕێگەی عاشقبوونن. "سوهرابی سوپێهری" موعجیزەی سروشت دەیکات بە عاشق، بە ڕاددەیەك لە دەقێکیدا بە ناوی ( سووڕەتی تەماشا) تەماشاکردن بە سووڕەت ناو دەبات، گەلایەك بە موعجیزە و بەلگە دەزانێ "چاو هەڵێنە ئایەتی لەمە باشترت دەوێت"، بە بۆچوونی ئەو ئەگەر موعجیزەی شەقکردنی مانگ و موعجیزەی درەوشانەوەی دەستی موساش نەبا، هەر دەبوو باوەڕ بێنین. چونکە گەردوونیش هەم موعجیزەیە، هەم پەیام و ئایەتی بینراو. عاشق –مەولانای ڕۆمی واتەنی– دەبێ (ئیبنولوەقت) بێ، بە تەعبیری (سیروس شەمیسا)ش لە وەسفی "سوهرابی سپێهری"یدا دەبێ ڕاوچی ساتەکان بێت. "سوهراب" دەڵێت:

هەر ڕۆژێکمان ڕۆژێکی تازە بێت بەیانیان کاتێ خۆر هەڵدێ لەدایکبین. عیشق چرکەکانی خەڵوەت کردنە لەگەڵ خۆت و مەخلوقات، "سوهراب" گوتەنی: عاشق هەمیشە تەنیایە، دەستی عاشق لە نێو دەستی ناسکی چرکەکاندایە و ئەو و چرکەکان ئەچن بۆ ئەوبەری ڕۆژ، ئەو و چرکەکان لەسەر نوور ئەخەون، ئەو و چرکەکان باشترین کتێبی دونیا بە ئاو ئەبەخشن نیوەشەوانیش بە بەلەمی دێرینەی ئیشراق ڕەوانەی ئاوی هیدایەت ئەبن تا تەجەللای سەرسامی سەوڵ لێدەدەن. عیشق بەرهەمی بینین و ڕامان و بیرکردنەوە و خوێندنەوەی قووڵ و پەرستشی زیندووە. لای عاریفی گەورە "مەولەوی تاوگۆزی"یش عیشق لەدایکبوونەوەیە:

**هەرکەس تەوەلود دووبارەش نییەن**

**لابد سەعادەت ستارەش نییە**

**موسعەب ئەدهەم: مەرجەکانی عیشق چین؟**

نەبەز هەورامی: بەر لە هەرچی، دەبێ مرۆڤ خودی خۆی بکات بە پرسیار، ئامادەبێت بە دوای خۆیدا بگەڕێت و خۆی بدۆزێتەوە و بناسێت، لە کوێوە هاتووە و دەبێ بەرەو کوێ بڕوات! بێگومان لەوێشەوە خالیقی خۆی دەناسێت، ئیدی دەیەوێ هەست بە بوونی بکات، پاشان پەردەکانی نێوان خۆی (خودە دۆزراوەکە) و خالیق بتوێنێتەوە، واتە دۆزینەوەی حیکمەت و مەبەستی بوون و بەرچاو ڕوونبوونەوە و بەسیرەت و ناسین لە

ڕێگەی حاڵ و موکاشەفەوە نەك تەنێ لە ڕێگەی زانستەوە تا گەیشتن بە سەرسامی و مەستبوون و بێئارامی، تۆ بزانە مرۆڤ بە عیشقی هاوڕەگەزێکی چی بەسەر دێت، وەك داستانەکانی عیشق دەیگێڕنەوە، ئەدی عیشق بۆ خالقی مرۆڤ و سەرچاوەی جوانییەکان!

**موسعەب ئەدهەم: ئەو هەموو کاریگەری و بەرهەمە مەزنانەی لە عیشقدا هەن، بۆ؟ چی وایکردوە هێندە گەورە و کاریگەر بێت؟**

نەبەز هەورامی: بەرهەمە مەزنەکانی عیشق ژیانیان جوان کردووە، گەورەترین بەرهەمی عیشق ئەخلاقە" ئەخلاقیش جوانکەری ژیانە، شیعر و هونەریش کە بەرهەمی عیشقن ژیانیان جوانکردووە. بینین و بیرکردنەوە و بیستن، مرۆڤیان جوان کردووە. شیعر و هونەر بە هاناوەچوونی ڕۆحیانەی مرۆڤن، مرۆڤ و ژیان پاك دەکەنەوە، هەست و ڕۆحی تیفتیفە دەدەن، ناسکی دەکەنەوە. (مەولەوی تاوگۆزی) فەرهادیش بە عاشقێکی گەورە نازانێ، چونکە قولنگی لە ڕووی دیدەی خۆی (مەعشوقەکەی) وەشاندووە:

**هیچکەس نەواچۆ وەفەرهاد رەندەن**

**نەقش شیرینش نەرووی سەنگ کەندەن**

**دەك رێزان دەسبا وەر جە گیانسەندەن**

**کێ نەشتەر وەرووی دیدەی وێش شەندەن**

ئەوکاریگەرییە ڕۆحییەی دێڕە شیعرێك، تابلۆیەك، دیمەنێکی هونەری پارچە موزیك یان گۆرانییەك لە سەر مرۆڤی جێدێڵێت لە کاریگەری شتی دی ناچێ. ئایینەکان کە بۆ جوانکردنی ژیان هاتوون، بۆ بە بەهەشتکردنی ژیان و لە بەهەشتی ژیانیشەوە بۆ بەهەشتی جاویدانییەت، دەقەکانیان پڕن لە شیعریەت و لە هونەر، بەڵکو سەرچاوەی شیعریەت و هونەر و جوانکارین.

**موسعەب ئەدهەم: لەسەردەمی نوێدا و لەسەردەمی تەکنەلۆژیادا چۆن بتوانین عاشقێکی ڕاستەقینە بین؟**

نەبەز هەورامی: گوتمان عیشق پێوەندی بە فەزای ئایینەوە (بە گشتی) هەیە، مرۆڤیش لە هیچ سەردەمێکدا ناتوانێ دەسبەرداری ئایین ببێت، هیچ شتێك ناتوانێ ببێت بە جێگرەوەی ئایین، نە زانست نە فەلسەفە نە سیاسەت، ئەگەر ئاییندارییش ئاییندارییەکی نادروست بوو، بە دیلەکەی ئاییندارییەکی دروستە نەك شتی دی. ئایینیش هەڵگری درەوشاوەترین و کاریگەرترین تیشکە بۆ نێو دونیای ڕۆح و مەعنەوییەت. پێشکەوتنی گەورەی ڕۆژاوا لە زانست و فەلسەفە و تەکنۆلۆژیادا، نەیتوانیوە دیوە ڕۆحی و مەعنەوییەکەی مرۆڤ تێر بکات، جاری وا هەیە مرۆڤ لەوێ لە نێو ئەو هەموو ڕۆشنایییەی زانستدا بۆ سکوونەتی ڕۆحی ئەفسانە یان فەزایەکی ئایینی دەستکرد دەبێت بە دالدەی. من وا دەزانم

بەردەوام مرۆڤ حەوجەی بە عیشقە، کە ئەو تینوێتییەش هەبوو مرۆڤ ڕێگەی گەیشتن بە دەریا دەگرێتەبەر، مرۆڤ لە نێو گەورەترین ناز و نیعمەتی دونیادا، ناتوانێ هەست بە تێربوونی تەواو بکات، کەرەستەکانی ژینی دونیەوی و چێژ و خۆشیەکانی، هەر خۆیان کاتی و کەمتەمەنن، سوهراب گوتی: "مەرگ ئاوێتەی ژیانە، سییەکانی لەززەت پڕن لە ئۆکسجینی مەرگ." بە تەنیا ئەوانە مرۆڤ بە ئاسوودەیی و نەمری ناگەیەنن، جاری وا هەیە هەر خۆشیان دەبن بە هۆکاری شێواندنی ژیان و کۆتایی پێهێنانی. مرۆڤ مادەم بە دووی نەمریدا وێڵە ناچارە کە دەبێ ڕێگەی عیشق بدۆزێتەوەو بیگرێتەبەر، ئێستا بزافی ڕۆحیگەری ( نیو ئەیج) ـ وەك هاوڕێم مامۆستا "حەسەن هەمزە" لەم ماوەیەدا وتارێکی لەبارەوە نووسیبوو ـــ لە ڕۆژاوا بزافێکی زیندووە، ڕاستە دەشێ ئەم ڕۆحیگەرییە هەمووی ڕاستەخۆ لە ئایینەوە سەرچاوەی نەگرتبێت. مادەم مرۆڤ خودانی ڕۆحە و هەر لە جەستە نەخولقاوە، دەبێ بەردەوام بە دوای دونیای عیشقەوە بێت. ڕاستە تەکنۆلۆژیا و پێشکەوتنی پەیوەندییەکان و هۆکارەکان، کاریگەری نەرێنییان لەسەر بەها ڕۆحی ئەخلاقییەکان هەبووە، هەرچەند ئەوەش بەرهەمی مامەڵەی مرۆڤ بووە نەك خودی تەکنۆلۆژیا و مادییات، بەڵام مرۆڤ دەزانێ بە لە دەستدانی ئەو بەهایانە بەشێکی گەورەی لە مرۆڤایەتی خۆی لە دەستداوە، کە ئەوەش کارەسات

بۆ ژیان دەخولقێنێ، ڕاست و پێشکەوتن بەبێ بەها و ئەخلاقی مرۆڤانە وێرانکارییان لە دوایە. بە کورتی وەك مەولانای ڕۆمی گوتویەتی "عیشق نەبێت عەقڵ دەمانخوات." هاوسەنگی نەکردن لە نێوان دیوی ڕۆحی و مادیی ژیاندا، مەترسی لە دوادەبێت، دەنا ئەو دوو دیوە دەتوانن تەواوکەری یەکدی بن. ئایین بەردەوام ویستوویەتی ئەو هاوسەنگییە ڕابگرێ، پاش دوورکەوتنەوە لە ڕۆحی پەیامی حەزرەتی موسا (س) و زاڵبوونی دیوە مادییەکە، خودا سەرزەنشتی ئەوان دەکات، پاشان پەیامی ڕۆحانیانەی حەزرەتی مەسیح (س) دەنێرێت بۆ پڕکردنەوەی ڕووبەری ڕۆحی، لای هێندێکیش لە پێڕەوانی ئەو کە لادان دروست دەبێت و ڕۆچوون لە دیوی ڕۆحیدا بەسەر ژیان و ئاییندا زاڵ دەبێت، دیسان ئەوەش بەر سەرزەنشتی خوداوەند دەکەوێت، کە ئایینی ئیسلام دێت دەبێت پارێزەری ئەو هاوسەنگییە بێت، هێندێك تەفسیر (وەسەتییەتی ئیسلام) بە پاراستنی ئەم هاوسەنگییە دەکەن، ئەڵبەت لە دونیای ئیسلامیشدا لادان و ڕۆچوون بە یەکێك لە دیوەکاندا هەبووە و هەیە. بەڵێ لەم سەردەمەشدا عاشقان، عاشقانی گەورەش هەڵکەوتوون، سیروسی شەمیسا لە ڕوانگەی شیعرەکانی سوهرابەوە دەڵێت: "لەم سەدەی میعراجی پۆڵاو بە یەکدادانی کانزایانەدا، مرۆڤ دەسبەرداری پەیبردنی عیرفانی نەبووە." هێرمان هیسە و کارل یۆنگ و دەشێ سەدانی تریش

لەناو دڵی ئەورووپای پڕ شەڕ و شۆڕ و لە چاخی قوڵاییی دەریا و ترۆپکی ئاسماندا عارفانە ژیاون و بیریان کردۆتەوە. "بەڵێ هەموو سەردەمێك ئایینی پێویستە، بە تایبەت دیوە عیشقی و ڕۆحییەکەی، دەشێ هێندێ شتی ڕواڵەتیانەی ئایین بە شتی دیکەی وەك یاسا پڕ بکرێنەوە، بەڵام دیوە مەعنەوی و ڕۆحییەکە جێگرەوەی نییە. لە ڕاستیدا لە ڕۆژاوا هێندەی دیوە ڕۆحی و عیشقیەکەی ئایین کاریگەری و حزووری هەبووە، دیوە فیقهی و ڕواڵەتییەکەی نەیبوو. با بەم چەند وشەیەی سوهراب کۆتایی بەوەڵامی ئەم پرسیارە بهێنین: (ئەشێ کاری ئێمە ئەوە بێ کە لە نێوان گوڵی نیلۆفەر و سەدەدا وەدووی ئاوازی حەقیقەت بکەوین)، نیلۆفەر ڕەمزە بۆ عیرفان.

# شاعیرانی ئێمە ڕۆحیان گەڕاڵ و سەرخێڵی جوانی بووە

"هومایون ساحیب"

**موسعەب ئەدهەم: گەر "جوانبینی" یەکێك لە تایبەتمەندی و سیفەتەکانی عاریفان بێت و ئەدەبیاتی کوردیش وەك ئاوێنەیەك کە چەندین عاریف و عاریفی شاعیری تێدا دەبینرێت و ئەمەش وا بکات ئەدەبیاتی کوردیمان ڕەنگدانەوەی ئەو جوانی و جوانبینییەی تێدا نومایان بێت، بۆچی نەوەکان و ئەدەبیانمان لەم سەردەمەدا نەیانتوانیوە ئەو چێژ و جوانبینییە درێژە پێ بدەن؟ یان بە مانایەکی تر بۆ ئێمەی مرۆڤی سەردەمی نوێ بگوازنەوە؟**

هومایون ساحیب: کەم کەس هەیە وەك کورد (تاك – نەتەوە) لەو شوێنەی پێویست نییە، خۆی بابدات بە ڕابردووە و مێژووی بکاتە حاویە. بەڵام هیچ کەسێك وەك کورد، خەریکی بچڕاندنی ئەڵقەکانی مێژووی نەبووە، هەمیشە خۆی بە یەکەوە بچڕاندووە و ئیتر تا هاتووە ئەو هەر تەنیا یەك بووە. ئەمە لەئەفسانەوە تا ئێستای، تەواوی هونەر و ئەدەبی هەروا سەیرکردووە. لە زمانیشیدا هەروا کاری کردووە. کورد زۆرکەم بیری لە گرێدانی ئەڵقەکانی کردووە. بۆیە هەرچی هاتووەتە ئاراوە وەك ڕەفزکردنەوەی پێش خۆی کاریکردووە، گەر خۆیشی وا نەبووبێت بەو

جۆره خوێنراوەتەوە. کە لەڕاستیدا ئەمە بۆ هەرچی دروستبێت بۆ ئەدەب و هونەر ڕەنگە دروست نەبێت.

باوانی ئاوەدانی ئێمە کە توانیان لەو چێژەدا بژین هی تەماحیان بووە بە جوانی، ڕۆحی ئەوان گەڕاڵ و سەرخێڵی جوانی بووە، گەشتی بە سەردەمەکاندا کردووە، ڕەگی ئەدەبەکەی ناوەتە دوورترین و قووڵترین زنەی زمان و ئەندێشەی میللەتەکەیەوە. شوێن مەولەوی بکەوە بزانە تا کوێ درێژ دەبێتەوە؟ بە داخەوە ئەوان وەجاخ ڕۆشن نەبوون لەو بابەتەی پرسیارەکەی جەنابت مەبەستیەتی. باری کۆمەڵایەتی و دۆخی سیاسی جەنجاڵی سەدەی ڕابردووی ئێمە، هەڵپەیەکی زۆری شیعار و ئایۆدۆلۆژیای دروستکرد! خەمێکی تری خولقان و خەیاڵی جوانی و گۆمی عەشقی شڵەقاند و تێکی دا! پووشیان خستە چاوەکانی ئەو نەوەیەوە و بەچاو پروان و چاو هەڵگلۆفین سەرقاڵیان کرد! لەوەش ماندوو بوو! ئێستا خەریکە دەیەوێت بچێتەوە سەر سفرەی پڕ چێژی ئەوان! پێشبینی دەکەم ئەو گەڕانەوەیە سۆما و تینی جوانیبینی پێ ببەخشێتەوە.

**موسعەب ئەدهەم: گەر بە پۆلبەندی جیهانی مۆدێرنە و جیهانی پێش مۆدێرنە "کۆن و کلاسیک" قایل ببین، بۆچی لەسەردەمی نوێ و تەکنۆلۆژیادا ناتوانین ئەو ئەدەبیاتەی کە لەسەردەمی پێش مۆدێرنەدا**

**هەبووە و چەندانی وەك "مەحوی و مەولەوی و نالی و ... هتد" ی بەرهەم هێناوە، لەم سەردەمەشدا مرۆڤی لەوجۆرە بەرهەم بهێنێت؟**

هومایون ساحیب: بڕوانە جیهانی نوێ چ بازاڕیکی خولقاندووە. چەندایەتی هۆکار و کاڵاکانی بردە کوێ؟ کەچی ئێمە ئیختیارمان دۆڕاند! تۆ ئێستە لە هەرکوێ بیری ئازیزێك دیمەنێك... هتد بکەیت لە چاو تروکانێکدا تاپۆکەی دێتە پێش چاوت. ئیتر تەماحەکانی ئەندێشە و خەیاڵت پیلکیان ئەتسێ! ئەو کەڵکەڵەیەی هەتبوو دەرفەتی نییە بگاتە ڕۆحت و ڕۆحت بخاتەگەشت. ئیتر تۆ وەکو ئەوان (مەحوی، نالی، مەولەوی و... هتد) دروست نابیت و بەرنایێیت!

بەڵام بڕوانە ئەوان گەر بیرێکی وەهایان بووبێت، مەولەوی لە سەرشاتە یان سەرقەڵاوە بۆ دۆستان و پیران و هاوفەردەکانی یان نالی لە شامەوە بۆ شار و کوچە و کۆڵان و حوجرەکەی، چونکە جیهانەکە تەکنۆلۆژی نییە! ئیختیاری سەیر بەوان دەبەخشێت. دەسەوداوێنی شەماڵ! ئاخر شەماڵ لە کوێ و فەیسبوك لە کوێ!

ئیتر جیاوازی ئێمە و ئەوان جیاوازی ئاسمان و شاشە و شەماڵ و خەت و یاری کەوشەك و کرمەکەیە! جیاوازی دەسرو تۆشەبەرەیە، لەگەڵ قاپ و سفرەی سەفەریدا! هی بەردەنوێژ و خاك و گیایە، لە گەڵ سپلێت و فەرشەکاندا!

کەسێ دەتوانێت بێتەوە بەوان لە شوێنکاتی خۆی هەڵبێت! ئەو خەڵوەیە چەند مومکینە! مەولەوی و مەحوی ئەم سەردەمش لەو ئاستی ئیمکانەدان! ئەوە خەڵوەتی ئەوانە مانا بە شتەکان دەدات، خەڵوەتی ئەوان بریتی بووە لە گەشت لەناو خۆیاندا، گەشتی ناوخۆ بارتەقای گەڕانە بەکەون و کائیناتدا! ئەمەش دونیادیدەیی و مانا بەخشین و ئاستی بەرزی تێگەشتنی بەرهەمهێناوە.

**موسعەب ئەدهەم: کە ئەدەبیاتی کلاسیك دەخوێنینەوە هەست بە گەرموگوڕی و عیشق دەکەین؟ واتە ئەدەبیاتی کلاسیك زیندووە؟ بەڵگەی ئەمەش ئەو هەموو هێما و ڕەمزانەی سروشت کە بەکار هاتوون و ئەمە بەدەر لەوەی کە هەر جیهانبینی جیاواز بووە.**

هومایون ساحیب: ئەوان مردوەکانیشیان وەك زیندوو چاو لێکردووە، ئێمە زیندووەکان وەك مردوو، دەبینین. زیندوویەتی گەرموگوڕییە و مردنیش ساردبونەوە و ساردوسڕی. لای ئەوان بەرد و شووشە و گۆزە و دار و خەڵوز و قامیش و دەوات و مەرەکەب و دەسڕ و گۆرەیی و عەبا و شەوبۆ و وەنەوشە و خوێ و ئەستێرە و تاڤگە و گۆچان و پێڵاوەکانیان دێنەگۆ! ئەوانە مەخلوقن و هەردەم لە مەسەلە گرنگەکانی عەشق و مردن و ژیان و فراق و وەسڵ و تەنانەت ئاژاولەیماڵیشدا (نێوانی ژن و مێرد)

قسەیان هەیە! زەمینەی بڕیار خۆش دەکەن و هۆکارن بۆ ئەزموونی سەرکەوتوو.

**مدیان گورالآن نەپای دەریەندان**

**ئەو یەکتر وێنەی ئارەزوومەندان**

**جەم جەم سۆسەنان جە لانزاران**

**نە مەسئەلەی خەم گفتوگۆ داران**

لە دیوانی شاعرانی کۆن بڕوانە. کەشکۆڵەکەی شێخ مۆمنی مەردۆخی ببینە، بزانە یەك شتی مردوو دەبینی. لای ئەو شاعیرانە ژیان هەیە. لەنێو شتەدژەکاندا سازان و هەڵکران هەیە! ئەمەش پێناسەی ڕاستەوخۆی گەرموگوڕی دەکات. بە پێچەوانەوە لای ئێمە نەسازان. هەڵنەکرانی دژەکان، ئەمەش ڕاستەوخۆ وێنای مەرگە. تەنانەت هەر خودێکیش سازانی دژەکانی نێو خۆی تێکدا، ئەوە ژیانی نییە. با بە فیزیکیش نەمردبێ. مردوویەکی گەڕۆکە! بۆیە شارەکانی ئێستا لە گۆڕستان دەچن! تەنیا جیاوازیەکەیان خامۆشی و ژاوەژاوە!

بێجگە لەوەش ڕووبەری ژیانکردن، زەمین و زام "ئەزموونی دووەمی ئادەم" بە تەواوی کات و شوێنییەوە، سروشتێکە هەواری دۆستە، بارگاوی بووە بە شوێن پێکانی سیفەتی یار، خاکی موقدەسە بە تەجەلاکانی، بۆیە ڕوانین لەو سروشتە، ئەندێشەی بە پاکوخاوێن

سەیرکردنی پێ بەخشیوون، ئیتر هەموو شتەکانی ئەو سروشتە لای ئەوان نووری پەیدا کردووە و نوورانییە، بۆیە حکایەت و باسی شیعری ئەوانیش نووری عیرفانی تێزاوە. مەولەوی هەموو دەشت و دەر بە بۆنی ئەو پڕ دەکات:

**بۆی باڵات هەرزان بە دەشت و دەر دان**

**نمەز ڕای لای تۆم وەکام گوزەر دان**

نالی لە بەهارە شیعرێکیدا کۆتاییی شیعرەکەی پیرۆزدەکات و زەمین بە بەهارەوە دەکاتە داوێنی دەرکەوتە و تەجەللای حەق. نەعلەکانی فڕێ دەدات، چونکە بەهار بە دەرکەوتە و وڵات بە تورێکی تر دەزانێت:

**وادی بووە بە وادیی پڕ نووری"طور"ی نار**

**نەعلەین لە پێ فڕێ دە"نالی" بە "ئەیمەنی"**

بە کورتی هەمیشە شاعیرانی کلاسیک لەگەڵ کەسێکا دۆست بوون، لە خۆیان جوانتر و بەرز و پیرۆزتر و بەتواناتر، ئەمەش دڵنیایی و متمانە و ئارامشی ڕۆحی پێ بەخشیون. کاتێ سەیری شیعری کلاسیک دەکەیت تەنانەت ئەوانەشیان خەریکن بە زینەتەکانەوە بە دەوری هەوا و ئارەزووی مرۆڤانەدا دەخولێنەوە کۆتاییان بە بادانەوە و تەقیەکردن دێت لەو کەسە بەشکۆیە، بێسارانی نموونەیەکی بەرزی لەو مەیدانەدا هەیە.

**موسعەب ئەدهەم: دەروونناس و بیرمەندی بەناوبانگ "ئەریك فرۆم" پێی وایە ئێمە کەسێکمان خۆش دەوێت لەبەرئەوەیە خۆمانی تێدا دەبینینەوە، پێت وانییە لەبەرئەوەی ئەدەبیاتی کلاسیك هێندە لە لامان بەرز و جوانە، چونکە خۆمانی تێدا دەبینینەوە؟ بۆچی ئەم ئاوێنەیە لەم سەردەمەدا بوونی نییە و گەرەبێت بەراورد ناکرێت بە سەردەمی پێش مۆدێرنە؟**

هومایون ساحیب: ڕەنگە نەتوانم لە بۆچوونەکەی فرۆم تێبگەم. یان لانی کەم بۆ هەموو شتەکان وابێت. چونکە ئاوێنە هیچت ناداتەوە بێجگە لە خۆت! یانی دەبێ ئێمە خۆمان جوان بین – تێگەشتنی من وەهایە – ئێمە لە کلاسیکدا جوان بووین. یانی گەنج بووین، ئێستا ناتوانین وابین، بڕوانە پۆترێتی پیریی شاعیرانمان خۆش دەوێت، ئەوانەی بەدیع باباجان. بەڵام پیرێکی نێو خەڵوەتگەی پیری یان هی کوچەییێکمان خۆش ناوێت. بە مانایەکی تر کەسێ پێت بڵێ پیریت یان پیردەنوێنی پێت ناخۆشە! لەبەرئەوە بۆیاخ دەکەین. کەچی جزیری و نالی و مەولەوی و مەحوی دەخوێنییەوە حەز ئەکەیت لە حەفتا ساڵەی تەمەنیان بیت. خۆت لێدەبێتە ئەوان و عەشقێنی دەکەی لە تەك سەلما و حەبیبە و عەنبەرە و شەمەکانی ئەوان.

کـاری ئاوێنــه نییــه! کـاری بــه جێهێشـتنی زەمــەن و گەڕانەوەیـە، مەسەلەکە لای من بازنەییـە ئێسـتا دونیا پیربـووە. ئێمـە پـیرە بێهێـز و پرزە لێبڕاوەکانین. ئەوان بە سەروسیمای پیریانەوە گەنجە زیندووەکانن! بۆیە لە ڕووی تواناوە بە ئـاواتین بۆیـان. دەیانخوێنینـەوە دەبـین بـەوان، عیشق دەکەین و گەشت دەکەین. یانی چوونەوەیە بـە ڕێگاکـانی ئەوانـدا. ئەوان هەمیشە یارێك لەبەردەمیانـدا عیشـوە دەکـات. ئـەو یـارە سـەنەی بـاڵقی دەکاتــە هــەزار سـاڵ و پــیری دووردەخاتــەوە. ئەمــە تــەنیا لای شاعیرانی نێو بازنە ئایینییەکە بەوجۆرە نییە بەڵکە لای گـۆرانیش کـە لـە ئەندێشــە و دونیــا بینیــدا جیــاوازترە هەروایــە. بڕوانــە دەرکــەوتن و زەردەخەنەی ئەو یارە چ تین وتاوێکی ژیان دەداتەوە بە گۆرانی نزیـك لـە لێـواری گـۆڕ. بوونی"یـار" لای ئــەوان مانـای بــە ژیـان داوە، ســەردەمی ئێمەش سەردەمی بێ "یار"ە، ئێمە بـۆ مانـاداری ئـەو ژیانـە نیازمـان بـە ئەدەبەکەی ئەوانە، ئەمەش کاتێك ماندووت ناکات بازنەیی گەشت بکەیت. یانی تۆ ڕێگە دەبڕی و دەچییە پێش، دەچیتەوە خاڵی سـەرەتا و شـوێن پێکانی ئەوان دەدۆزیەوە. لە ڕووی تیرۆیشـەوە ئەمـەی دەوترێـت ڕێگـەی پیاوچاکان گرتنەبەر هەروەهایە، یانی گەڕانەوە و وەك ئەوان ژیـان. ڕێگـە و ژیانی ئەوان خۆش بـوو، یـانی ئـەدەبیان شـیرین و جـوان. پێمانخۆشـە گوناهەکانی ئەوان بکەین و دەستی دوعای ئەوان بەرز بکەینەوە. سـەیری

سروشت و ژن و تەواوی جوانییەکانی ناخ دەکەین. لەبەرخۆوە گۆرانی دەڵێین بۆیە ئەو گۆرانیانەی لە شیعرەکانی ئەوان سازدەبن، خۆشترن. ئیتر گەر سیفەتی ئاوێنە بدەینە کلاسیك و ئاوێنەش تەنیا کاری شکانەوەی وێنە و دەرخستنەوەی خۆت بێت! ئەوە کلاسیك ئاوێنەیەکی موجیزەییە. چونکە دەتوانێ بمانکات بەوان. واتە کلاسیك بۆچوونەوە سەر جوانی ئیکسیر و کیمیایە.

ئێستا گەر وەها ئاوێنەیەك لەم سەردەمەدا نەبێت، یان هەبێت و بەراورد نەکرێت بە پێشین بە بڕاوی من هەر ئەوەیە کە پێشتر باسمانکرد. ئێستا سەردەمی کۆپییە و فریوبازییە. یانی نامانەوێ هیچ شتێ هەبێ بۆ هەڵسەنگاندنمان. ئەمە لە مەسەلەکانی ئاییندارى و عەشق و مەوعید و نەخۆشی و ڕواڵەت و تەواوی شتەکاندا قبوڵمان نییە. یانی لە ڕاستیدا ئاوێنەمان (هاوڕێ، کتێب، ڕاستی) ناوێت. هیچ هۆکار و پێوەرێکمان بۆ هەڵسەنگاندنی خۆمان قبووڵ نییە. پێچەوانەی ئەو شاعیرانەی کلاسیك. ئەوان هەردەم ئەزموونیان کردووە و هەڵسەنگاندنیان بۆ خۆیان کردووە. بڕوانە شێخ ڕەزا بۆ مەسەلەی دەمار و توانستی پیاویی لە ڕووی سێکسییەوە چ ڕاستییەك دەبێژێ و چ ئاوێنە و پێوەرێکی سازاندووە.

بە کورتی سەردەمی ئێمە سەردەمی دەمامك و نواندنە، کەس خۆی نییە، ئیتر کاری ئاوێنەسازی نییە و چونکە لە بازاڕدا حەفتا ساڵ بە

بیست ساڵ دەبینی! ئەمە گەر شاعیر بێت و شیعرێك بۆ یارەكەی بنووسێت، دەبێتە ئاوێنە!

**موسعەب ئەدهەم: عیشق و عیرفان و مەعنەوییەت لە ئەدەبیاتی كلاسیك دەچۆڕێت، بە جۆرێك ناتوانین باسی ئەدەبیاتی كوردی كلاسیك نەكەین گەر بێتو نووری عیرفان و مەعنەوییەت باس نەكەین، تەنانەت گەر پێشمان وابێت دەقەكان خوێندنەوەی عیرفانی و مەعنەوی هەڵناگرن، ئەوا هەر دەبێت ئەو ڕەهەندە فەرامۆش نەكەین؟**

هومایون ساحیب: سیانەی (عیشق و عیرفان و مەعنەوییەت) كۆبوونەوەی ژیانی ڕاستەقینەیە. بۆیە تۆ گەر نەشتەوێت بژیت هێشتا خۆت ناكوژیت. بێ لە ڕووداوان و دەربایس بوون، گۆرانی میللی و ئەدەبی فۆلكلۆریشمان ئەو خوێندنەوانە هەڵدەگرن. چوونكە نمای ژیانێكی (حەقیقی و زیندوو ئاوێنەیەكی ڕاستەقینەن) هەموو زیندووبوونێكیش فەزڵی عەشقە یانی بێ عەشق مردووین:

**دل بی عشق را افسردن اولی**

**هركه دردی نداره مردن اولی**

عیشقیش ڕاهێنانت پێدەكات و هێزت پێدەبەخشێت، بەرگە دەگری و دەرد و بەڵاكان ناتبەزێنن. هەر بۆیە لەگەڵ ئەو هەموو سەختی كار و ژیان

و دەرد و دواکەوتووییەی لە کۆمەڵگەی ڕابردووی ئێمەدا هێشتا مرۆڤەکان بە ورەن. مەعنەوییەت بێجگە لەودیوەی هێز هیچی تر نییە.

نەبوونی ناتخات، چونکە لە مەدرەسەی عیشق و تەریقەتدا ڕاهێنانت کردووە لەسەر (سەبر، فەقر، شوکر، تەوەکول، ڕەزا،... هتد)ەوە. دەس بەڕوونان و بێمەیلی یارێك، بێوەفا و سپڵەت نەکات، کاری تۆ دووپات کردنەوە و جەختە لەسەر مەیلی خۆت. بێ لەبەر چاوگرتنی پیاوەتییەکەت، لای بابایەك، ناپیاوت ناکات، دینی تۆ پایەدارییە، کاری تۆ عیشقە، ئیتر ئەوە دەبێتە بڕوا و تۆ لە مەعنەوییەتدا دەژیت. گەر بە گۆرانی و فۆلکلۆردا بگەڕێین، نموونە بۆ ئەو بابەتە زۆرە و شیعری کلاسیکی کوردی ناوەبەرزەکان بە دەوروخولی ئەو سیانەوەن.

لێکۆڵەری کوردی لە تەمەنی لێکۆڵینەوەی خۆیدا بەو ڕاستییە دەگات، کەسێ ئەگەر بەو چەمکانە پەست بێت، هی ئەوەیە پێی وایە تۆ باس لە شەریعەتێك دەکەیت، چوونکە ئێمەش سەدەیەکە بە ئایدۆلۆژیا قانگدراوین، لەڕێوە پارێز دەکرێت لەو چەمك و ناونیشانانە! من خوێندنەوەکەم لەسەر مەولەوی ناونا "شەریعەتی مەیل" کەچی زۆرێك لە دۆستانی خوێنەوارم لە بێژەی شەریعەت سڵیان کردەوە. دەبێ هەشبن پێیان وابێت مەعنەوییەت و عیرفان و عیشق، دەبێت فەرامۆشکرێن. لە ڕاستیشدا نابێ باسکردنی (عیشق و عیرفان و مەعنەوییەت) بە ئاقارێکی

تەنگەبەردا ببرێن و بچنە مەرزی ئایدۆلۆژییەوە. بەڵکو ئەوانە لە ئایدیا و شەریعەتەکان پان و پۆڕترن و مەرزی هەموانیان بڕیوە. فەرامۆشکردنی ئەو خوێندنەوە عرفانییە ناهەقیەکی گەورەیە لە مێژووی ئەدەبی و ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی کوردیدا.

**موسعەب ئەدهەم: بۆچی ئەدەبیات و نووسینی ئێستامان بە شێوەیەکی گشتی ئەو ناسکی و ڕۆحەی تێدا نابینرێت، گەربوونیشی هەبێت هەوڵی تاکەکەسێن و وەکو پرۆژەیەکی گەورە کاری لەسەر ناکرێت؟**

هومایون ساحیب: تاکو ڕووبەری گەشت و گێڵی ڕۆحی تۆ تەسکتر بێت، تا مەساحەی سروشت و دواندنی ئەو سروشتە کەمتر بێت. (دیدەکەیلی و دڵپڕی) ناکەوێتەوە. ئاخر خۆ ئێمە بە پەلەکان ناژین! چوارمێخیش کرێین، هەستەکان بەسن بۆ ژیان لە ڕاستیدا. شاملۆ واتەنی: تەنیا دڵ بەسە بۆ ژیان. ئێمە ڕۆحمان دیل کردووە. هەنگی دیل گوڵ نابینێ و ناسکی تام ناکات و شیلە ناخاتەوە. ئاخر شەو و ڕۆژ لە ئۆفیس و کاری وەزیفی و بەتاڵی فەیسبوکدا هەنگی ڕۆح لە کوێ ئاوارە بێنێ، با لەم شیعرە سادەوە باسەکە ڕوون بکەمەوە:

**هەنگەکەی ڕۆحم پەرواز کەردەوە**

**ئاوارەش جە زوڵف لەیل ئاوەردەوە**

ناسکی ئەو شیعرە بە مانە دروست بووە، لەیلێ هەبێت و دووربێت، بۆ ئەوەی بۆی بچیت و ڕێگەی چوونەلای بگریتەبەر. ئەو لەیلە خاوەنی زوڵفی تەڕبێت. بۆ هەنگوین سازی دەوری هەبێت. ڕۆح هەنگ بێت و توانای فڕینی هەبێت و پێوەدانی نەبێت، خۆ گەرکارێکی وای لێقەوما دەبێت بمرێت. بۆیە عیشق و هەنگوین بە یەك دەچن! تەنانەت مانگی بوك و زاوای پێوە ناونراوە.

ناکرێت لەیل لە کورسییەکەی ئەو بەرەوە بێت. چوونکە دوور ڕۆشتنی، هەنگی ڕۆح دەکوژێت، پێوەدان دروست دەبێت و لە ئاکامیشدا دەس بە هەنگوین ڕاناگات. ئێمە ئێستا هیچ عەشق ناکەین، هەموو ئەو شتانەش بەو باس و خواسانەوە باسدەکرێن، لە ڕاستیدا بە پێوەری هەنگوین شیرین نین!

بازاڕی ڕابردووی ئێمە لەو ڕووە گەرمتربووە، دیدەکەیل و دڵپڕتربوون چونکە شوانێ، سەپانێ، گاوانێ، بەو دیدەوە عاشق بووە، تەنانەت هەموو گوناهەکانیشیان ڕژاونەتەوە نێو سروشت. سروشت شتەکان دیکۆمێنت دەکات، کاری سروشت ناسکە و ناشرین نییە. بۆیە شاعیرە عاشق و عاریفەکان لە خوێندنەوەی سروشتەوە وانەی تەواوی عەشقیان خوێندووە و گوێیان بۆ نموونە ڕژاوەکانی نێو سروشت گرتووەتەوە. بەوەش بەهرەمەندبوون و ناسکیان بەرهەم هێناوە. شاعیری ئێستا گەر

خۆیشی بیەوێت دەستی بە داوێنی خەیاڵ ناگات. ناشبێتە قوتابخانە و لە تاکەکەسیدا قەتیس دەبێت، چونکە شوێنێ نەماوە بۆ هەڵگرتن و دانانی ناسکی! خوێندنەوە و ڕامانیش وەك شتەکانی تر سەرپێیین و لە کۆڵ خۆدەکرێنەوە، وەك پرسە و عیادەی نەخۆش!

بڕوانە مەولەوی چەند پارچە شیعری ناسك وەك پرسە بۆ کوژرانی کوڕی مەحموود یاروەیس دەنووسێت کە دۆستی مەولەوی بووە، ناسك و جوانن، لە سۆزی هەڵکێشاون، بە ڕۆح بەشداری کارەساتەکەی کردووە، شیعرەکانیش ڕۆڵیان بووە لە سولْح و ئاشتەواییدا.

ئایا ئەکرێ شاعیر بیت و لە ناوچەی پیشەسازی سێ ڕۆژ بە دیار سەیارەوە بیت. کەچی ساتێ نەمابێت بۆ خۆدانە بەر تریفەی مانگ و گوێگرتن لەهاژەی ئاو!

**موسعەب ئەدهەم: چی وایکردووە دەقێکی کلاسیك ئەو هەموو خوێندنەوەیە هەڵبگرێت، واتە دەشێ فرە خوێندنەوەیی بۆ دەقی شاعیرێك بکەین و لەگەڵ هەر خوێندنەوەیەکیشدا کۆمەڵێك گەوهەر و مرواریمان دەست بکەوێت، بەڵام ئەم فرە ڕەهەندییە بە گشتی لە دەقێکی نوێدا کە لەم سەر دەمەدا نووسرا بێت نابینرێت و هەڵگری تەنها خوێندنەوەیەکە!**

هومـایون سـاحیب: ئـیتر لێـرەوە پرسـیارەکان مەسـئولییەتی زیـاتر دەخەنە سەرشانی وەڵام، بۆیە دەمبووری ئەگەر ڕووبەری خـۆم بـۆ وەڵام تەسکتربکەمەوە. جارێ لەو ناوە زۆر و زەوەندانەی کلاسیك کە ڕەخنـە و لێکۆڵینەوەی کوردی بەجدی کاریان لەسەربکات ڕەنگە نەگەنە بیست ناو. ئەوانەی تر وەك سەرژمێری بۆ مێـژووی ئـەدەب تۆمـارکراوون. مـن زیـاتر ڕووم لەو بیست ناوەیە.

هەریـەك لەوانـە بـۆ خۆیـان بـە پێـی پێوەرەکـانی ڕۆژی خۆیـان کەڵەخوێندەوار بوون. مـەلای نێـو زانسـت و زمانـەکانی دەوروبـەر بـوون. خاوەنی بیرۆکەی بەرزوو پڕۆژەی گـەورەبوون. لـەنێو مەدرەسـە و وانـە و موناقەشە گەرمەکاندا بوونیان هەبووە، زانستەکان هەموویان خـوێنراون و تخەسوس باوی کەمتر بووە. میحوەری خوێندنی ئـەوان بایـەخی بـۆ یـەك هەناسە و یەك چرکە داناوە، ئەوانە مرۆڤی کات بوون و هیچ کاتێکیان بـێ ئەندێشە و بیرکردنەوە و تێڕامان نەگوزەراندووە. یانی بەردەوام دەوریـان کردووەتـەوە. حـوجرە و مەدرەسـە و تەریقەتـەکان ڕۆڵیـان هـەبووە لـە تیفتیفەدان و دەمەزەردکردنی بەهرەی ئەواندا، تەنانەت شـاعیرە یـاخی و دژەکانیش هەر لەوێوە پەیدا بوون. بۆیە شیعری ئەوانە زۆر هەڵدەگرێت،

بابەتەکان تێکەڵ بوون، ئەکادیمیای ئێستا دەبێ تەقەی سەری بێ لەو عیلمانەی ئەوانی کردە داهێنەر.

دیدگای ئایینیی ئەوان، شارەزاییان لە مەزاهیب و تەریقەتەکان و قوتابخانەکانی دەوروبەر، کە ئێمە بەس ناویان دەزانین، سەرباری هەمووی کەلتووری نەرم و نیانی بۆ نمایشکردنی پرۆژە و دەرکەوتە نوێکان.

بڕوانە بیری خانی بۆ کوردایەتی و پرۆژەی دینداری کوردی، لە جزیری بڕوانە و سەرنج بدە لەو بیرەی کە شیعری کوردی بباتە ئاستی شیعری فارسی و بەربەرەکانێی حافز. لە مەولەوی بڕوانە بۆ کەلامی کوردی و لاهوت و شەریعەت و تەریقەت و ماریفەت. لە نالی تێبگە بۆ کەڵکەڵە و ئەندێشەکانی زمان و حاکمیەتی دیوان. مەولانا بخوێنەوە و هەوڵەکانی لە فەرامۆش نەکردنی حەقیقەت و بایەخدانی بە چینی بۆر! ڕۆحی وەفایی و هونەری سەماع و گۆرانی. مستەفا بەگی کوردی و غەرامیات و مۆسیقا. سالم و فۆرمی قورسی زمان. مەحوی و عەشق و گۆڕینی ڕووی کۆچی پێغەمبەر لە یەسیربەوە بۆ خاکی بابان. دواتریش شێخ ڕەزا و کامێرای گرتنی وێنەی ڕاستی تاك و دۆخی کۆمەڵگا. پەیژەی هەریەکە لەوانەش بۆ ئاسمان و ناسینیان بۆ خودا. ئەمانە وای کردووە دەقەکانیان هەڵکێشن لەو مەفهووم و چەمکانە، ئیتر پەنجەرەی دەقێکی ئەوان کرایەوە و

تەواوی دونیای لێوە دیارە. دەقە نوێکان لەدونیای "تەخەسوس"دان. چونکە پەرەسەندنی دۆخی خوێندن ئەو تاکە دروست و ئامادەدەکات، هەرچەندە هەیانە خوێندنەوەی جۆراوجۆر هەڵدەگرێت. بەڵام جیاوازییەکە فراوانە، بڕوانە مۆبایلە شیعر و عەشق، تێفکرە لە چوارینەکانی باباتاهیر و عەشق.

**موسعەب ئەدهەم: گەر سەردەمی بەرهەمهێنانی ڕەمز و مرۆڤی مەزن لەناو شیعر و ئەدەبیاتدا بەسەرچوو بێت؟ چ شتێك جێگەی ئەوە دەگرێتەوە، لە بنەڕەتدا ئامانجی ئەدەبیات بە گشتی و شیعر بە تایبەتی لە ئێستا چییە و چ ئەرکێکی هەیە؟**

هومایون ساحیب: من گیرۆدەم لە وەڵامی ئەم پرسەدا، بۆیە ناچارم بپرسم: ئایا کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لێدەگەڕێ ڕۆحی بکوژرێت؟ دەبووریّ و ڕازی دەبێت بیّ مرۆڤی مەزن بێت؟ لە هەموو سەردەمەکاندا مرۆڤ پێویستی بە دڵدانەوە و لاوانەوە هەیە. بەڵام کاتێ ئەو مرۆڤانە دەردەکەون بمانلاوێننەوە و دڵمان بدەنەوە، ئێمە بە دڵشکانی خۆمان گەیشتبین! یانی هەست بە هەپروون بوونی ڕۆح و خاشاك بوونی دڵمان بکەین.

بە بڕوای من ئامانجی شیعر کردنەوەی نوشتە و گەرد و خۆلی پرسیارە کۆنەکانی مرۆڤە، کە لەگەڵ دروستبوونیدا بوونەتە کەڵکەڵەی؟

ژیان و مردن و گەنجی و پیری و ئێستا و ئەوسا و ئێرە و ئەویّ و عەشق و غەریزە و ڕۆح. کەرتبوونی ژن و پیاو، پێداویستییە مەعنەوییەکانی تۆ، بۆ داسەکاندن و ئارام گرتن. هۆکارەکانی بەرەودان بە ژیان بەو دەسمایە کەمەی عومرەوە، دواجار گەیشتن بە تەسلیم بوون و وەك ئیمپراتۆرە ئازاکان لە بەردەم ئەجەلدا و ملدان بە سەفەر. یانی گەیشتن بە پێناسەی مرۆڤی خۆت، نە زیاتر، نە کەمتر، ڕێك مرۆڤبوون. ئیتر ئەوکات خۆبەخۆ زمانت دەبێتە مۆسیقا و قسەت دەبێتە شیعر، دروست وەك مەولانا. قەرار نییە تۆ هونەرمەند و شاعیر و ئەدیب بیت، بڕیارە تۆ مرۆڤ بیت. مرۆڤ بوویت دەست بە هەموو ئەوانەدا ڕادەگات. ئیتر لە وەڵامی پرسیاری دواتریش نزیك دەبیتەوە.

**موسعەب ئەدهەم: جێکەوتی شیعری عاریفێکی کورد نەك چەندین ساڵ بەڵکو بۆ هەتاهەتایە دەمێنێتەوە، ئەو شیعرە هەڵگری چ پەیامێکە کە ئەو جێککەوتەی دروستکردووە؟**

هومایون ساحیب: ئەو شیعرە، ئەو ئاوازە، ئەو قسەیە و هەر شتێکی تر کە تەمەنی لە ڕۆژگارەکەی خۆی زیاتر بڕ دەکات پەیوەندی بە خولگەی جوڵەی ئەوەوە هەیە.

هەر شیعرێك لەو شاعیرانەی مەبەستە دەوری کردووەتەوە، پەی بە ڕۆحەکان بردووە، لە لەوحدا دۆستایەتی دروست کردووە لەگەڵ ئەو

گیانانەشدا کە زۆر دوای ئەو دێنە سەر ژیان. بادەنۆشی دەستی ئەلەستە، هـەڵگری پـەیامی گرێـدان و بەسـتنەوەی ئـەزەل و ئەبـەد و سـەرەتا و کۆتاییە. پێشگۆیی دەکات و هەواڵی دواترت دەداتێ، ئەزموونی ڕابردووت پیشان دەدات و شرۆڤەی هەمان هەستی تۆ دەکات کە بەرامبەر هەرشـتێ هەتبووە. هەر شیعرێك دەمی تەڕ بوو بە بادەی دەستی سـاقییەك، ئـەوە سینەساف و زێڵ زوڵاڵ دەبێت. گرنگ بـەجێ هێشـتنی منـە و گەشـتن بـە تۆ. یان ناسینی تۆیەکە بۆ شەیدایی منێك. بڕوانە لەم شیعرە:

**مەستم وە بادەی ڕۆی ئەلەستی تۆ**

**وەسەن یەك جامێ مەی جە دەستی تۆ**

**ئایینەی زێڵم ڕۆشنەن چوون مەی**

**جەو ڕۆ بیەنا مەی پەرستی تۆ**

ئەوانـەش ئـەو مەسـتییە بـەریان نـادات و بـەو مەسـتییەوە دەگەنـە مەحشەر! چوونکە ئەوە بادەیەکە شیعرەکانی سەکران کردوون و لە بـری هەڵیت و پەڵیت بە سەحو گەیشتوون! زمانیان بەجۆرێ لیریکی بووە، لـە زمانی قاڵەوە بووەتە حاڵ و تەواوی توخمەکانی هێناوەتە گۆ.

بڕوانە مرۆڤ لە ئێستادا کە گوێ لە گۆرانییەکی سەید عـەلی دەگرێـت، بێئـەوەی ناوەکـانی کـوردی و تایەربـەگ و مـەلا سـاڵحی حـەریق بناسـێ، شیعرەکە دێت و ڕۆح و دڵی کاردەوەژە دەکـات، ئەلەمـەکانی دەردێنـێ و

نەشئە و ئارامی دەداتێ. بڕوانە لە هێزی ئەو شیعرە لە خاوەنەکەیەوە فڕاندوویەتییە لای سەید و لە هێلانەی گەرووی ئەویشەوە چۆن دەردەپەڕێت و دەچێتە ئاسمان.

**موسعەب ئەدهەم: ئەدەبیاتی کلاسیکیمان کە لە شیعردا بە زۆری بەرجەستە بووە، مانایەکی قووڵی تێدا شاردراوەتەوە، بۆچی لە ئەدەبیاتی نوێدا کەمتر دەق هەڵگری مانایە؟ ئەمەش جیا لەوەی "مانا" لە سەردەمی مۆدێرنەدا هەمان ئەو "مانا"یە نییە کە لە سەردەمی پێش مۆدێرنەو کۆندا بوونی هەبووە؟**

هومایون ساحیب: شاعیرانی کلاسیك نیانە مەسەلەی خەڵوەی بە هەند وەرنەگرتبێت، لە دڵ تێکەڵی و تێکەڵ بوون دووریان گرتووە، گەرچی لە ڕواڵەتدا مەجلیسییش بووبن، بە مانا عیرفانییەکەی لە خەڵوەتا بوون. ئەو خەڵوەتەی جەوەڵ جەوەڵەکانی دەروون و سەحرا و بیابانەکانی خۆیانی پێ تەی کردوون، بەمەش توانای ماناخولقانیان لە بێ ماناییی شتەکانەوە دەست خستووە، بە مانایەکی دی هەموو شتەکانیان گواستەوەتەوە بۆ قووڵاییەکانی خۆیان و لەوێوە ئۆکسانیان بە سەردا هێناون و مانایان پێ بەخشیوون.

ئاخر هەموو ئەوشتانەی مرۆڤ لە ئەزموونی ژیانیدا دەیانبینێ و دەیانبیستێ، پێویستییان بەوە هەیە لە بیر و ئەندێشە و خەیاڵیدا

دەوریان پێبکاتەوە، بۆ دروستکردنی زمانێکی تر و پێدانی مانایەکی تر بەو شتانە. بڕوانە تەرکیبە ڕۆحییەکانی جزیری و مەحوی و مەولەوی لە شیعردا. هەرئەوەی جەنابت بە شاردنەوەی مانا تەعبیری لێدەکەیت، وایە. ئەوان لە ژیانیاندا ئەوەی کەوتووەتە بەرچاویان لەو خەڵوەتەی کە "فکر" پێویستیەتی گواستوویانەتەوە بۆ قوڵاییەکانی خۆیان و کە داویانەتەوە چەندین مانای هەڵگرتووە. بۆیە بۆ دۆزینەوەی ماناکان پێویستمان بەو ئاستە قووڵبوونەوە و خەڵوەتەی ئەوان هەیە.

سەردەمی نوێ سەردەمی گورج و خێرا و حازر بەدەسە، نەك هەر ئامادە نییە کەمێ زیاتر بۆ ئاو بڕوات و تینوویەتی بەرێتە لووتکە بۆ منای بەرزی ئاو، ئەو ڕازی بووە لە قوڵایی دوور کەوێتەوە و ئاو بکاتە دەبەوە بۆ تینوویەتی و ئیتر ئەو مەیلەی بۆ ئاو هەیە دەم و دەست دەبێتە هەڵم! دەقە سەرکەوتووەکان لە هەر سەردەمێکا نووسرابن شتێکیان بۆ مانا هەبووە.

**موسعەب ئەدهەم: بۆچی وێنە و وێنەگەری تاکو ئاستی تەواو ڕووکەش لە دەقی نوێدا دەبینرێت، کەچی بە پێچەوانەوە ئەو وێنەیەی کە پێشتر بوونی هەیە و لە دەقی کلاسیکدا دەیبینین لەگەڵ ئەوەی وێنەشن، بەڵام قووڵترن و زیهن و بیرمان بۆ جێگای دیکە و پرسیاری دیکەی قووڵی فیکری و فەلسەفی دەبەن؟**

هومـــايون ســـاحيب: دەقـــی نـــویٚ نوێنـــەرو نیگارکێشـــی ســـەردەمی خۆیـەتی! سـەردەمی ڕووکەشـی زیـادو زانسـتی نیـوەو ناچـڵ لای هـەر کەسێك! ڕازیە بـە مەلـەی تـەنکاو، خۆشـخۆرە لەسـەر قـاپی سـەفەری و هەموو شتە سەفەری و یەك بار مەسرەفەکان، ئیتر هەر ئەوەیـە خۆیشـی یەکبار مەسرەف دەبێ و بە یەکجار خوێندنەوەو گیانی دەردەچێت.

**موسـعەب ئەدهـەم: گـەر ڕووکـەش و ڕووکەشـگەرایی سـیفەتێکی سەردەمی نویٚ بێت، ئەمەش قسە گەلێك لە بیرمەندەکانە لەمەڕ چییەتی سەردەمی نویٚ، ئایا ئێمە دەتوانین لە دەقی کلاسیك تێبگـەین وەکـو ئەوەی کە پێویستە؟**

هومایون ساحیب: لەم ڕوکەشستانەی سەردەمی ئێمەدا کە دەمانـەویٚ لە دەقی کلاسیك تێبگەین، تووشی تەنگـەژە دەبـین، تەنگەژەیـەك کاتـیٚ دەڕەوێتەوە ئێمە میتۆدی خوێندنەوەکانمان بۆ کلاسیك میتۆدی لە بـاری خۆی بێت. هەرچەندە من وەك قوتابخانەکان بڕوای تەواوم بـەو ناونانـەی (کلاسیك و ڕۆمانتیك) نییە، بەڵام پێویستە سەردەمی نووسینی دەقـەکان بناسین. پێناسەی چەمکەکان ، زەمینەی دەرکەوتن و بەرهەمی ئەندێشـە و پەیدابوونی ناوەکـان، تێگەشـتن لـە زانسـتەکانی سـەردەمەکە و زانـینی زمانی نووسینی دەقەکان. تەنانەت بەوەش ناگەینە تێگەشتنی پێویسـت، چوونکە ڕووبەڕووی سەدان وشە و زاراوە دەبینـەوە کـە بـەکاربردنیان لـە

فارسیدا، هەمان ئەو بەکاربردنەی نییە لە دەقە کوردیەکەدا، بێجگە لەوەش لە ڕووی فۆرم و ڕوخساریشەوە ئیملای وشە دەتوانێت خوێندنەوەی جۆراوجۆرمان بۆ قووت بکاتەوە، بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، ناتوانین بە تێز و تیۆریای دوورتر لە خودی کلاسیك لەو ئەدەبە بگەین. یانی ناکرێت بە تێخ و قوڵەنگی بچووك و کول، بە تەمای هەڵکەندنی بیری قووڵ بین.

**موسخەب ئەدهەم: "ڕاز" و "ڕازئامێزی" یەکێکە لەو چەمکانەی دەشێ لە زۆرترینی دەقە کلاسیکییەکاندا هەستی پێ بکەین و گەلێك بەکارهاتووە، بۆچی ئێستا ئەو ڕازە بوونی نییە؟**

هومایون ساحیب: ڕەمز و ڕاز و سرڕ و حکایەتە شیرینەکانی تریش واریات و بەرووبوومی زەوی بەیاری عەشقن، پێوەری قانوونی تەجنوون بەرهەمیان دێنێت و پێوەری مەجنوون دەیانخاتەوە و ئیخلاس یەکیان دەخات و تووتی دەیانگێڕێتەوە. ئەوش مەسەلەیەکی پڕپێچ و موعەممادارى ئاڵاندووەتە دەقەکان، ئامانجی یەکەم پاراستن و پۆشینی ڕازی ئەوینە و ئامانجی دووەم بە شیرینی هێشتنەوەی چیرۆکەکەکانی عیشقە. لە ئێستادا تێگەیشتن بۆ چەمکی عیشق کرچوکاڵە و پێوەر و هەڵسەنگاندنەکانیش بۆ مەجنوون بوون سادە و ساکار، ئیدی یاساکانی تەجەنوون هەموار کراونەتەوە و بەو شێوەیەی لای مەحوی هەن ئێستا

نین، ئیدی هەزارویەکشەوەی ڕاز بووەتە مەسجێکی کورت و لەگەڵ ئەوەشدا ناخوێنرێتەوە و گوێی لێناگیرێت. ئەدەبەکەش هەر بەو هۆیەوە عامیانە و بێنموود بووە.

**موسعەب ئەدهەم: ئایا ئەو مامەڵەیەی هەندێك نووسەر و لێکۆڵەر دەیکەن، مامەڵەکردنێکی ڕووکەشیانە و خوێندنەوەیەکی مادیانە لەتەك دەقەکۆن و کلاسیکیەکاندا مامەڵەیەکی دروستە و دەمانگەێنێتە ئاسۆیەك بەرەو ڕووی کردنەوەی وەڵامی پرسیار و نهێنی دەقەکان؟**

هومایون ساحیب: بێگومان ڕوونکردنەوەکانم لە وەڵامەکانی پێشووتردا نەخێر دەخەنە بەردەم ئەم پرسیارە، چونکە ئەدەبەکە ئەدەبی تەنکاو نییە، قووڵە و لێکۆڵەر دەبێ نەترسانە لە قوڵاییەکان نزیك بخاتەوە. جیاوازی خوێندنەوەی ڕووکەش و ئەو خوێندنەوەیەی بۆ دەستخستنی گەوهەرەکان پێویستە، ئاسمان و ڕێسمانە، فەرقی گیانە لەگەڵ نینۆکدا. بەڵام یەکخستنی مەسەلەی خوێندنەوەش هەمووکاتێ بەلای قووڵ ڕۆچوون و خوێندنەوەی گیانیدا دروست نییە، دەقەکان خۆیان کلیلی ڕاستەقینە دەدەنە دەست خوێنەر. بەڵام بە گشتی ئەو ئەدەبەی من مەبەستمە بە ڕووکەشانە و مادیانە کاری لەسەر ناکرێت، چوونکە پڕە لە داوی وردورد و کەمینی زیرەکانە.

**موسعه ئەدهەم: بە بۆچوونی بەڕێزتان میتۆدی مامەڵەکردنمان بۆ خوێندنەوەی دەقە کلاسیکی و شیعری شاعیرە مەزنەکانمان چی بێت؟**

هومایون ساحیب: ڕەنگە کارکردن لەسەر هەر دەقێك پێویستی بە میتۆدی جیاواز و تایبەتمەندی خۆی بێت. بە گشتی شاعیرانی جێ نیازی ئێمە لە کلاسیك، لەسەر ڕێبازی عیشق کاریان کردووە و زۆربەیان چڵکاوخۆری حەزرەتی لەیلان. ئیتر لەو تەریقەتەدا تووشی چەندین دیاردەی دژ و ڕەوشت و حاڵی سەیرسەیر دەبین، عەقڵ و دڵ و ڕۆح و ئیمان هەریەك دەکەونە سەنگەرێ، زۆرجاریش دەکەونە بەرەیەکەوە. بۆیە حەوجێمان دەخەنە بەرقاپی چەندین تیۆریای جیاجیاوە بۆ شرۆڤەی هەریەك لەوانە، چڕکردنەوەی باسی ئەوان میتۆدی کارکردن دیاری دەکات.

لە عەشقەوە بۆ هەڵهێنجانی شەریعەتێکی ناسك و دەرخستنی دیوی ئەخلاقی تاکەکان، لە تەنگەژە و دوالیزمەکانەوە بۆ دەستخستنی سازان و هەڵکرانی دژەکان، تەواوی خوێندنەوەی ئێمە بۆ ئەزموونی ئەو شاعیرانە بە بۆچوونی بەندە بۆ خۆی دەبێت لە پێناوی عیشقدا بێت، واتە دەست گەیشتمان بە میتۆدی عیشق، ئیترخوێندنەوەی ئەوان میتۆدێ دەداتە دەست ئێمە بۆ خوێندنەوەی خۆمان، پێوەرێکمان دەداتێ بۆ هەڵسەنگاندنمان لە ژیاندا و دەمانخات بەسەر فەلسەفەی ئەخلاقدا.

**موسعەب ئەدهەم: چۆن دەشێ و دەکرێ جارێکی دی جوانی و ناسکی و ماناداری ئەدەبیاتی کوردی لە سەردەمی ئێستاماندا پیشان بدەینەوە و نومایانی بکەین؟**

هومایون ساحیب: ئەوەش دیسان پەیوەندی بە عیشق و عاشقی ئێمەوە هەیە، لانی کەم چونەوەمان بۆ سەردەمی زێڕین، ژیان دوور لە ئەتکردنی بەهاکان، عیشق لە زەمەنی سەربڕیندا!

دامەزراندنی قوتابخانەی ئەخلاقی، ناوەندەکانی ڕاڤە و خوێندنەوەکان پەرەپێبدرێن، مامۆستای قوتابخانەکان خوێندەوارکرێن. هەوڵە تاکەکەسییەکان، لە پێناوی مانادا یەکخرێن. سەندیکا و تیپ و هونەرمەندە گەورەکان ببنە هێز، بۆچوونیان بگاتە قەرار، بەر بەو پەرەسەندن و گەشە ناهونەرییە بگیرێت، میعماری لەو دابەشبوون و زۆربوونە شێرپەنجەیە ڕزگار بکرێت. جۆگەکانی دیدەی شیعری گۆران لە هەوراماندا خنکان بە دایبی و سفرەی سەفەری! سروشتی خاوێن بە سادەییی خۆی، دیدەکەیل دەکات لە جوانی ئیدی مرۆڤ یارمەتیدەرێکی هەیە بۆ بەرهەمهێنانەوەی ناسکی و کۆمەڵگەش بڕوا بە جوانی و ناسکی دەکات.

□

# که شاعیرانمان دەخوێنینەوە، خەریکە بیر و ئەزموون و ئەندێشەی کەسێک دەخوێنینەوە..

گفتوگۆ لەگەڵ "بوشرا کەسنەزانی"

**موسعەب ئەدهەم: جیاوازی ئەدەبیاتی کلاسیکی و ئەدەبیاتی مۆدێرنە یان سەردەمی نوێ لە ڕووی بوونی جوانی و فەزای شیعرییەوە لە چیدایە؟ ئەو هەموو جوانبینی و جوانخوازی و جوانناسییەی شیعر و ئەدەبیاتی کلاسیکیمان بۆچی دەگەڕێتەوە، لە کاتێکدا ئێستا کەمتر هەست بەو دیدە جوانبین و جوانیناسانە دەکرێت؟**

بوشرا کەسنەزانی: بۆ قسەکردن لە بارەی فەزا و جوانییەوە وێڕای پێوەرێکی گشتی، دەبێت بیرمان بۆ پێوەرێکی تاکەکەسیش بچێت، ناکرێت هەمیشە بە ڕەهایی لە بارەی جوانییەوە قسە بکەین. ئێستا ئەگەر قەرار بێت لە ڕووی جوانی و فەزا و مۆڵگەی شیعرییەوە تەماشای دوو جۆر لە ئەدەبیات بکەین، کە بە جۆریک لە جۆرەکان چەندە لێک دوورن هێندەش ڕاوەستاوی سەر یەك شارێن، ئەوا دەبیت قسە لە بارەی سێ چەمکەوە بکەین، کە بەر لە هەرشتێك شیعر چ دێرین و چ نوێ بەو سێ چەمکەوە وابەستەیە. ئەویش خودی بەرهەم لە ئاستە فراوان و ڕووبەرە گشتییەکەدا، وەك هونەر و دەق، لە بوارە زۆر وردەکەشیدا بۆ

ئەم باسە، شیعر، ئافەریدە یان نوسەر، وەرگر بە هەموو چەشنەکانی وەك خوێنەر، بیسەر یان بینەر. بە دیاریکردنی پێگەی ئەم سێ جەمسەرە دەتوانین قسە لە بارەی جوانی و زەمینەی دوو جۆر ئەدەبیاتەوە بکەین.

لە بەرکەوتی یەکەم دا، نوسەر یان هونەرمەند بە پێی مەقولە و تیۆرە دێرینەکان، گرنگە، ئەو کەسەی ئافرێنەری هونەر و شاعیرە، کەسێکە ئاگایی قووڵی بەرامبەر بە شتگەلێك هەن، کە وزە بەخشی شیعرین. بۆ نموونە ئەگەر بابەتەکەمان زۆر سنووردار بکەین بۆ شیعری کلاسیکی ڕۆژهەلاتی، لە ناویشدا شیعری کوردی و فارسی و عەرەبی و تا ئاستێکیش توركی. ئەوا ئەم شیعرە لە زەینی کەسێتییەکەوە شۆڕدەبێتەوە بۆ ناو زمان، ئەم کەسێتییە نموونەی دانایی و زانابیە، لە لایەك پێگەشتووی ناو خوێندنگەی ئایینییە بە زانین و پراکتیکیکردنی خودی شەریعەت و دواجاریش بۆ هەندێکیان تەریقەت. ئەمە وەك ڕوویەکی ئایینی، وەك بواری زانستی تەواو شارەزان لە زمانەوانی بە پلەی یەکەم عەرەبی، بە پلەی دووەم بۆ تورك و فارس و کورد، زمانی خۆیان، هاوتا شێوەزارە جوداکانی نێو زمانەکەیان، بە ئاگایە لە فکر و بیری بیرمەندە ئیسلامی و تا ڕادەیەکیش یۆنانی و هیندی دێرین، دواجاریش نەك هەر بە ئاگا بەڵکە ڕاڤەکەری ئەدەبیاتە بە قاڵبە شیعرییەکەی. ئەم کەسێتییە بەو هەموو داناییە فراوان و بیرە قووڵەوە، بە دەر لە نوسەرێتی یان

شاعیرێتی خەرمانەیەکی تایبەتی بە دەورە لە دەمی گفتوگۆ و کۆڕ و کۆبوونەوەکان بە زۆری پیاوانەکاندا، ئەم کەسێتییە جێگەی ڕێزە، بۆیە بەو خەرمانە کە شیعرێك دەڵێت لە دەمی خۆیدا هەر خودی ناوەکەی بەهایەك دەداتە بە شیعرەکە، پێش خوێندنەوە، پاش خوێندنەوەش بە وردبوونەوە لە هونەرکاری و سەلیقەسازی، بە دەربڕینی بیرە ئاڵۆز و فکرییەکانی، خوێنەر هەست بەو شکۆمەندییە دەکات کە جەنابت باسی دەکەیت، هەست بە جۆرێك لە قووڵی لە قاڵبوونەوە دەکات، خوێنەریش بەرەو بیرکردنەوە کێش دەکات.

ئەمە وەك نوسەر کە لە دەمەکانی دێریندا ناو زۆر گرنگ بوو، بۆ ئەو پرسیارەی کێ وتی؟ ئەمە هی کێیە؟ جەمسەری دووەم وەك دەق، کە لە قۆناغەکانی دواتردا دەق بووە سەنتەری گفتوگۆی نێو ڕەخنەی ئەدەبی، خودی دەق هەڵگری بیر و هونەرکارییە، لە شیعری کلاسیکیدا دەقێکی جدییە، وەك چۆن لە یۆنانی دێرین دا بە شانۆگەری تراژیدی دەوترا، دەقێکی جدییە، گاڵتە هەڵناگرێت، وەهاش لە شیعری کلاسیکیدا دەقێکە بە جۆری داشۆرینیشییەوە بابەتێکی جدییە و گاڵتە هەڵنگارێت، بەو واتایەی تۆ ڕادەگرێت لەبەردەم خۆی و هۆشداری ئەوەت پێدەدات، ئەمە موعەمایەکە کەشفکرنی سانا نییە، پرسیارێك دێتە ئاراوە، موعەمماکەی لە چی دایە؟ بۆ لە شیعری نوێدا نییە؟ باشە وەڵامی پرسیارەکە

دەدەینەوە کە دێتە پێش، لە بەرکەوتی یەکەمدا بۆ شیعری کلاسیك خوێنەر دەزانێت ئەمە تاکە نموونەی شیعر نییە لە بەردەستی، بە بێ ئەوەی ناوی شاعیرەکە پێ بزانێت، چونکە شیعری فۆلکلۆر و هاوتا شیعری میللیشی دیتەوە. خوێنەر سێ جۆر نموونەی لەبەردەستە، بە بەراورد کردنی ئەم سێیانە دەزانێت ئەم شیعرە موعەممایە و سانا نییە.

با نموونە بێنینەوە:

**دەترسم بمرم تۆ نەبینمەوە**

**بە جوانەمەرگی سەر بنێمەوە**

ئێستە دەتوانین ئەم شیعرە بەراورد بکەین بە شیعرێکی "مەحوی":

**ئەوا لەیلا بە ڕۆژی حەشرە دا وادەی لیقا مەحوی**

**هەتا قامی قیامەت ئاهو واوەیلا نەکەم چ بکەم؟**

دیارە خوێنەری زۆر سادەش دەزانێت، دوو نیوە بەیتی یەکەم چەندە سانایە و هەر ئێستا ئیمەش دەتوانین دروستی کەین، یان گۆرانیبێژان وەك بەند لە دەمی گۆرانی گوتن دا بۆیان بێت. تایبەتمەندییەکەی هەم سادەیە هەم کێشی برگە، بەڵام دوو بەیتی دواتر موعەمماکەی لە ڕیتم و ترپە و کێش و سەرواکەیدایە لە شێوەی یەکەم بەرکەوتن دا، دواتریش وەك مانا. شیعرەکە کە زۆرینە کۆکن لەسەر ئەوەی ئەمە شیعرێکە بە ناواخنی بیری سۆفیزمی ئیسلامییەوە، لەیلا ڕۆژی یەك بینین دیاری

دەكات، بەڵام كەی؟ ئێستا؟ سبەی؟ نەخێر ڕۆژی حەشر. هەر ئەم دیاریكردنەیە وا لە شاعیر دەكات بەردەوام بێت، تا ئەو ڕۆژەی دەگات ئەم ئاهو واوەیلا بكات، كە بە جۆرێك لە ناو وشەی واوەیلادا دیسانەوە هاواركردن بۆ لەیل و مەحبوبە، پاشانیش بە سەنتەربوونی ئەو ڕۆژە، كە هەم ڕۆژی دیدارە، هەم ڕۆژی كەس بە كەسییە، مەحوی دەبێت بۆ ئەو ڕۆژەش بگری، نازانێت دەیبینێ یان نا. ئەمەیە وا لە خوێنەر دەكات هەست بە مەزنی دەقێكی كلاسیكی بكات. كاتێك نالی شیعری كلاسیكی نووسی، لەسەر دەمی ئەو دا شاعیرانی میللی كەم نەبوون، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو، بەو جۆرە شیعرە، چونكە بیرو هزر و توانای ئەو زۆر لەو زیاتری پێ بوو ئیدی بۆچ لە چوارچێوەی میللی دا قەتیسی بكات، بیری مەزن زمانی مەزن دەریدەبڕێت، بۆیە دێت بەو شێوە قووڵ و موعەماییە دەنووسێت.

تەوەرەی سێیەم خوێنەر یان وەرگرە. لە دەمی دێرین دا بەهای خوێنەر بە هێند وەنەدەگیرا، لە ئێستادا خوێنەر زۆرترین ڕووناكی لەسەرە، ئەوە خوێنەرە بڕیاردەدات. لە دەمی كۆن دا خوێنەر دەبووە دوو بەش، بەشێكی لە چینە سادەوساكارەكەبوون دەیانویست دەقێك ببیستن زمانحاڵی دەروونیان بێت، بۆ نموونە بەند و لاوژە فۆلكلۆرییەكان كەڤ دڵی ئەوانی دادەمرانەوە، بەشێكی كەمیشی خاوەن ئەندێشە و

مەعریفە بوون، شتێکیان دەویست کە پەنهانییەکانی دەروونیـان بـۆ وێنـا بکات، ئەو شتەش شیعری کلاسیکی بوو. ئەم جۆرە خوێنـەرە ئەگەرچـی کەم بوون، بەڵام هێند بەئاگابوون، ڕۆڵی دیاریان هەبوو لـە بڵاوکردنـەوەی ئەدەبە کلاسیکییەکەدا.

لە ئەدەبیاتی کلاسیکی دا ئەم سێ تەوەرە یـەکگرتوو بـوون و لـە نـاو هەمووشیاندا مەعریفەی قووڵ ئامادەیی بەردەوامی هەبووە. ئێستە ئێمە لە شیعری نوێدا با بێن ڕووبەڕووی هەرسێکی بینەوە. کێیە ئـەوەی شـیعر دەنووسێت؟ دەقەکەی چۆنە؟ ئـەی کێیـە دەیخوێنێتـەوە؟ بـۆ منێـك کـە پێشتر چەشەی ئەدەبی کلاسیکیم کردووە و ئەو کەسـێتیانەم وەك مێـژوو ناسیوە، گرانە بتوانم چێژ لە شیعری کەسێك ببینم کە دەبینم مەعریفـەی کەمە، ئـەو حالـەی کـە لـە لای کەسـێتییە کلاسـیکییەکە هـەبوو نییـەتی، دەقەکەشی هەڵگری بیرێکی قووڵ نییە. بـە جۆرێـك دەکرێـت لـە شـیعری نوێدا یەك دوو شاعیر نەبێت (هی کوردی)، دەتوانین بڵێین مەعریفـە، ونـە، ئەمەیە مـن یـان تـۆ چـێژی لـێ نابینیـت، بـەڵام بـیرت بێـت وەك شـیعرە میللییەکە ڕەمەکی خەڵك چێژی لێ وەردەگرن.

**موسـعەب ئەدهـەم: لـە خوێندنـەوەی دوو بـەیتی (نـالی، مـەحوی، مەولەوی،.... هتد) کتێبێك مانامان دەست دەکەوێت، هەست دەکەین کتێبێکمان خوێندۆتەوە، بەڵام لە شیعری ئەمڕۆدا هەڵبەتە (هەندێکی کەم**

نەبێت) نەك هەر ئەوە بەدی ناكەین، بەڵكو لە كتێبێكدا هێندەی دوو بەیت مانامان دەست دەكەوێت؟ ئەمە بۆچی دەگەڕێتەوە؟

بوشرا كەسنەزانی: وەڵامی ئەم پرسیارە پەیوەستە بە قسەكانی پێشوومانەوە، كە نالی و مەحوی و مەولەوی دەخوێنینەوە، خەریكین بیر و ئەزموون و ئەندیشەی كەسێك دەخوێنینەوە. بیرێك كە زۆر قووڵ قاڵ بووە، ئەگەر بتوانم تەعبیر لە بیرەكەم بكەم سەبارەت بەم پرسیارەت، ئەوەیە ئەم شاعیرانە پاش خوێندن و وەرگرتن و بیركردنەوە، لە دەقی شیعرێكدا گومان و پرسیار و ئەنجامگیری بیرەكانیان دادەڕێژن، كە ڕەنگە زۆرینەی لە تەمەنێكی كامڵیدا پێی ڕاگەیشتبن، ئەو بیر و ئەزموونانە لە بۆتەی شیعردا دادەڕێژن بەو پەڕی هونەركارییەوە، ئیدی كە ئێمە بەری دەكەوین، ناچارین بیری لێ بكەینەوە چونكە ڕامان دەگرێت. وەفایی دەڵێت:

**دیسان لەسەر عەهدی الست جامێ لە جامان بگرە دەست**

**هەتا ئەبەد مەخمور و مەست هذا طریق العاشقین**

ئەم شیعرە قسەكەی جەنابت دەسەلمێنێت، تەنها ئەم دووبەیتە، گێڕەوەی نەك یەك حیكایەت چەند حیكایەتێك و چەند بیرۆكەیەكی عیرفانیی عاشقانەیە. بەیتەكە ئاماژە بە ڕێگەی عاشقان دەدات، دەی چ جۆرە ڕێگەیەك، ڕێگەیەك كە پێشتر خودا خۆی پەیمانی داوە بە مرۆڤ و لە

قورئان دا ئاماژەی پیّ دراوه ﴿أَلستُ بِرَّبِكُم، قَالُو بَلـى﴾ وەفـایی هـاتووه ئەمـەی لـه شـیعردا تـەوزیف کردۆتـەوه و بـۆ خـۆی بـەکاردێنیّ و دەبێـت مەخمور و مەست بێت، که هاتنەکه لـه ئەزەلەوەیـه و دەڕوات بـۆ ئەبەد.

ئەم بەیته وەك زۆرینەی شیعری نـویّ نییـه کـه مەعریفـەی قـوولّ نییـه و ناشیەوێت قوولّ بێت، چونکه له بنەوانەوه ڕێگەی بیرکردنەوه و خواسـتی ئەو و داواکاری ئەو له شیعر هەمان داواکاری نییـه کـه مـن و تـۆ هەمانـه، بەلاّم وێڕای ئەوەش شیعری شایسته و جوان هـەن، ناکرێـت کـه قسـه لـه شیعری نوێی کوردی دەکەین (پەشێو، بێکەس، هەلّمەت، ڕەفیـق سـابیر) له یادکەین. بڕوانه ئەو شیعرەی لەتیف هەلّمەت:

**بەفر که توایەوه دەبێت به ئاو**

**بەلاّم مرۆڤ که توایەوه دەبێت به پێلاّو**

**موسعەب ئەدهەم: ئەو هەموو جوانبینی و جوانخوازی و جوانناسییەی شیعر و ئەدەبیاتی کلاسیکیمان بۆچی دەگەڕێتەوه، له کاتێکدا ئێسـتا کەمتر هەست بەو دیده جوانبین و جوانیناسانه دەکرێت؟**

بوشرا کەسنەزانی: شیعری کلاسیك کۆلّەکه بنەڕەتییەکەی بـیره، ئـەو بیره هەموو زمانێك دەرەقەتی نایەت، ئەگـەر وەسـتایی و کارامـەیی تێـدا نەبێت، زمانێکی بارگاوی به ئەندێشه و هزر چ جـۆره زمانێکـه؟ ئایـا ئـەو

زمانـە ڕێ بـە هەڵەوپەڵـە دەدات؟ ئایـا ڕازی دەبێـت بـە زمـانی لاواز و نـا ئێستاتیکی بیری مەزن و قووڵ دەربڕێت؟ بێ گومان نەخێر، بۆیە ئێمە لە دەقـی کلاسـیکیدا بـەر جوانیناسـی زمانـەوانی دەکـەوین، بـە تێکشـکانی دەسـتووری زمـان و وێنـە دروسـتکردن و خواسـتن و درکـەوە. شـاعیرانی کلاسیکی دێن بە گەمەکردن بە زمانەکە تێمەی شیعری خۆیـان لـە قاڵـب دەدەن، جـاری وایــە وەسـتاییەکە سـانایە، بـەڵام ئیمـە درکمـان پـێ نەکردووە و ئـەوان توانیویانـە ئـەو وریـای و شـارەزاییە بـەکاربێنن. بـە نموونە نالی وەربگرین، لە چوار ئاستی فۆنەتیکی/فۆنەلۆژی، مۆفۆلـۆژی، سینتاکس، سیمانیتك کار دەکات. هەر چوار ئاستکەی دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، خەریکی وێنە ئافراندن و وشەسازی دەبێت، لە هەمانکاتێش بـە ڕووەکـەی تـردا ئـەم سـەنعەتکارییە نەبۆتـە هـۆی فەرامۆشـکردنی ناواخنەکەی بەڵکو لە پێناو بەرزڕاگرتنی ئەو بیرەی دایە. نالی دەڵێت:

**نەمردم من ئەگەر ئەم جارە بێ تۆ**

**نەچم شەر بێ هەتا ئەو خوارە بێ تۆ**

بڕوانە بە یـەك ئـاڵوگۆڕی ئاسـتی زمـانی بکـەر و بـەرکار و کـار، چـۆن شیعریەتی خولقاندووە، لە نیو بەیتی دووەمیدا لە بنەڕەتەوە دەسـتکاری وشەی شەرطی عەرەبی کردووە و کردوویە بە شەر/بێ تا لەگەڵ کێشکەی یەك بێتەوە، ئەمە داناییە، دیارە داناییەکەش خۆڕسك نییە، ئەزموون و

وەگرتن و فێربوونە. نالی هاوتا لەگەڵ کوردی و سالمدا بۆ دامەزراندنی قوتابخانەی شیعری کلاسیکی بابان، سوودێکی فرە لە ئەدەبی فارسی وەردەگرێت، بە حوکمی ئەوەی خوێندنی ئەو خوێندنی ئاینی بووە، دیارە مەرجی تەواوکردنی ئەو خوێندنە ئەزبەرکردنی بەرهەم حیکمەتئامێزەکانی سەعدی بە بوستان و گوڵستان و غەزەلیاتەکەیەوە، لەگەڵ مەسنەوی مەعنەوی و ئەسرارنامە و مەنتقولتەیری نیشابوری و چەندانی ترە، هاوتا وەك چێژ خوێندنەوەی غەزەلیاتی حافز و سائیب و کەلیمی هەمەدانییە، ئەمانە دەبنە نموونە بۆ شاعیرانی کلاسیکی ئێمە بڕوانە نالی بە قەولی خۆی چۆن حیکمەتی ئەدا دەکا:

**مروری نەکسە کە عەکسی قەمەر دەکا بە ڕەمەق**

**دوبولی نیکسە دەگێڕێ کە عەکسی ڕیش بە شیر**

بڕوانە ئەو شارەزایی و زمانئاراییەی نالی بۆ گەیاندنی مەبەستی کاردانەوە و بەرەو پیری چوون، چ هونەرکارییەك نیشان دەدات، تەماشای وشەی قەمەر و ڕەمەق، ڕیش و شیری بکە، چۆن لەگەڵ کۆی شیعرەکەدا کە باسی کاردانەوە و دیتنە، وەك لە ئاوێنەدا شتەکان بە پێچەوانەوەن، وەهاش وشەکان پێچەوانە دەکاتەوە، کە مانا پێکی خۆیان بن. ئەم هونەرئاراییە بە جۆرێك لە هەندێك شیعری نوێدا هەیە، لە ناو ئەدەبی کوردیدا شاعیرانێکی دەگمەن ئەم زمانئاراییەیان پێدەکریت، نموونەی

دیاریان شێرکۆ بێکەسە. شێرکۆ یەکێك لەو شاعیرانەیە شیعری موعەممای و ئێستاتیکی زۆری هەیە، ڕەنگە بە جۆرێك وێنەی نالی بێت لە شیعری نوێ دا.

**موسعەب ئەدهەم: جیاوازی عیشقی سەردەمی نوێ و مۆدێرنە چییە؟ گەر شیعر و ئەدەبیات پێوەری ئەم بابەتە بێت؟**

بوشرا کەسنەزانی: ئەم پرسیارە وەڵامدانەوەی بۆ من گرانە، پێشنار دەکەم بۆ جەنابتان، ئەگەر تەماشای فیلمی "عەشق" ی "میکایل هانکە"تان نەکردووە تەماشای بکەن، خۆ ئەگە تەماشان کردووە جارێکی دی تەماشای بکەنەوە. لە مۆدێرنەدا هەموو شت گۆڕاوە، هەموو شت بوو بە دوکەڵ و بە هەوادا چوو، مۆدێرنە سەردەمێکی بێڕەحمە بۆ مەبەدەئ و عەشق و عیرفان و ئەو فەزا جوانەی کە لە زەینی کەسانی وەك جەنابتدا هەن، سەردەمێکی بێڕەحم کە ئیتر هەندێ بیر و هەندێ مەقولە وەك ئەفسانە تەماشا دەکرێن، یان هەڵگرانی ئەو بیرە بە کەسانی دەروون نەخۆش و خورافی لێیان دەڕوانرێت. زۆر سەختە لەم دونیا ئاڵۆز و نوێیەی ئێستەکانێدا داوای عەشقێکی کاکەمەم ئاسا لە کوڕان بکەیت، داوای وەفایەکی لەیلی ئاسا لە کچان، چونکە ئیدی تۆ لەگەڵ واقیعێکی گراندا دەژیت، دەرفەتی چاوەڕوانی و موغازەلەی هێند تەسك کردۆتەوە ناچاریت پێ لە جەرگی خۆت بنێت و بەردەوام بیت، هەڵکەیت.

مرۆڤی سەردەمی نوێ دەبێت وەك هەموو شتەكانی تری چۆن زوو دەگوزەرێنێ! عەشقیش زوو بگوزەرینێ، وەك چۆن جۆری خواردن بچوك بۆتەوە بۆ كەی ئێف سی و ماكدۆناڵد، بەرگ لە بەرگی شكۆمەندییەوە بۆتە بەرگێكی سادە و كورت، ئاوهاش بابەتە مەعنەوی و ڕۆحییەكان گۆڕانیان بەسەردا هاتووە. ڕەنگە ئەو قسەیە بۆ كەسی مۆدێرنە ڕاست بێت كە من زۆرجارانم لە دایكم بیستووە، ئەوسا بەكەسانی حولحولی و زوو گۆڕاویان وتوە:

بۆرە نەبێ، بازە بێ یەكێ تەڕ و تازە بێ

هەر بەڕاست ئێستە دەبێت كەسێك بە كەسێكی تر بگۆڕێتەوە، كێ توانی هەڵكات لەگەڵ واقیعەكەدا ئەو براوەیە، بۆ ئەو مەبەستەش دۆڕاوەكە ئێمەین، هیچ نەبێت خۆم!

سەبارەت بە عەشقی ئەوسا و پەیوەستكردنەوەی بە ئەدەبیاتەوە، لەبەرئەوەی لەوسادا نەژیاوم، تەنها دەبێت بە وردبوونەوە و بەدواداچوون لەوە بدوێم، شتێك هەیە بۆ عەشقی ئەوسا، دان بە خۆدا گرتن و ئارامگری. عەشق لە دێریندا بە حوكمی سەردەمەكە ئەوەت لێ دەخوازێت، ئەگەر بە شێوە مەجازییەكەی بێت ئەوە دەبێت تۆ یان پێی بگەیت یان كە نەگەشتی بمێنیتەوە، تا ئەبەد ئەو عەشقە لە ناخی خۆتدا پەروەردە بكەیت، كە زۆر جار بۆ كەسانی سۆفی بەرەو عەشقی ئیلاهی

کێشیان دەکات. ئەگەر لە ئێستادا بۆ یەکێکی باس بکەین کە پەنجا ساڵ کوڕێکی خۆشویست و چاوەڕێی کرد، ئەوە وەك نەخۆشی تەماشا دەکرێت. وەختی خۆی کە فیلمی تایتانیکمان دی من تووشی شۆك بووم، چونکە پێوەری عەشقی لای من بە حوکمی فەزای خێزان و فەزای پەروەردە و جۆری بیرکردنەوەم ڕێگەی نەدەدا ئەو کارەکتەرە کچە شوو بکات، نەدەبوو! دەبوو وەفادار بێت بەو عەشقەوەی کە ئەوی ڕزگار کرد، بەڵام وا نەبوو، فیلمەکە لە بارەی ڕۆژاوا و لە بارەی سەردەمی نوێوە بوو، تۆ ناتوانیت بژیت و خەریکی خەیاڵ کردنەوە بیت، دەبێت بژیت و ئەوەی ڕابردوو وەك ڕابردوو تەماشای بکەیت، هەر بۆیە ئەو فیلمە هەزمکردنی بە ناواخنەوە بۆ من خەمهێن بوو.

ئێستە بێنەوە سەر کلاسیك، زۆر جار لە نێو شیعری شاعیرانی کلاسیك دا هەست بەو عەشقی نموونەیی و ئاسمانییە دەکەین، سەرسامان دەکات، بەڵام ئەو عەشقە بۆ ئێمە ڕوون نییە، ئایا بەڕاست بووە یان ئەوان وەك پێوەرێکی شیعری، غەزەلی عاشقانەیان وتووە! ئایا بەڕاست حەبیبەیەك هەبووە یان ئەمان بە ئەندێشە عەشق بازییان کردووە! ئەوانەی مێژوویمان لەبەردەستە وەك مەلای جزیری دەزانین عشقی مەجازییان هەبووە و گەیاندوونی بە عەشقی خودایی، بەڵام کەسێکی وەك نالی چی؟ ئەو عاشق بوو، یان وەك هەر یەك لە توانا زۆرەکانی دەیتوانی

به هونەرکاری عەشق نیشان بدات؟ ئەمە پرسیارێکە تا ئێستاش وەڵامی نییە، مامۆستا ڕێبوار سیوەیلی لە کتێبی نالیدا ورد قسە لەبارەی ئەوەوە دەکات، کە نالی لە ڕووی زۆر شتی مێینەوە ئەزمووندار نییە، بە تایبەت لە ڕووی هاوجێگەیی کردنی ژنانەوە، باشە ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، ڕەنگە کەموزۆر بۆ عەشقەکەش ڕاست بێت. یان بمانباتەوە بۆ سەر ئەو جیاوازییە کە بۆ عەشقی دێرین جودا بوو لە هی نوێ، ئەوسا دەوترێ ئەگەر نالی عەشقیشی کردبێ پێی نەگەیشتووە، هەر خودی نەگەیشتن جۆرێك لە ئەفسوس و خەم لای مرۆڤ جێدێڵێت کە هەمیشە وەك حەسرەت لەسەر دڵیەتی، بەڵام زۆر جار ئەم عشقە لە مۆدێرنەدا موستەحیل نییە دەگەن بە یەك و ژیانی ئاسایی وایان لێدەکات ئەم دووانە نەك هەر عەشقیان نەمێنێ، بەڵکە لە یەك بێزرایش بن، بۆیە هەوڵ دەدەن دیسانەوە بە شوێن کەسێکی تر و لە وێستگەیەکی تر بوەستن. ئەم جۆرە لە ئەدەبیاتدا ڕەنگ دەداتەوە، ئەدەبیاتی نوێ تەعبیر لە ژیانی نوێ دەکات، بۆیە لای من ئاساییە ئەگەر کچە شاعیرێك باسی ئەوە بکات لەیەك کاتدا حەوت پیاوی خۆشدەوێت، یان پیاوێك بڵێ من گیرۆدەی عەشقی ژنی زۆرم، چونکە سەردەمەکەی ئەوەیە و ئەو خەریکە خۆی دەگێڕێتەوە، ئێستە ئەو خود گێڕانەوەیە بۆ کەسانێك قورسە کە داوایەکی تریان هەیە لە عەشق، نەك بۆ کەسانی ڕێکردووی ناو مۆدێرنە. کەسێك کە

وەك شاعیرەكە بیربكاتەوە بێگومان شیعرەكەشی بە شاكار دادەنێ لە ڕووی تێماوە، بەڵام بۆ من كە پێوەری ترم هەیە، ئەمە ناخەمە ناو لیستی ئەو شیعرانەی كە خۆشمدەوێن، بۆ نموونە من چێژی فرە لە نازم حیكمەت لە مایكۆفسكی و نیرۆدا و شاملو وەردەگرم، خۆ ئەمانە شاعیری عیرفانی كلاسیكی نین، بەڵام جۆرێك لە عەشقت نیشان دەدەن كە لە سەردەمێ نوێدا هەیە و كاڵ نەبۆتەوە، وەختێك شاملوو دەڵێت:

كێیت كە من بەم شێوە

بە بڕواوە ناوی خۆمت پێ ئەڵێم

كلیلیماڵەكەم دەنێمە دەستت.

نانی شادییەكانم لە تەكتا بەش ئەكەم

لە پاڵتا دائەنیشم و لە سەر ڕانت

بەم جۆرە ئارام ئەچمە خەو؟

بڕوانە ئەو پرسیارەی لە عەشق هەیەتی قووڵ و جوانە، مرۆڤی عاشق بۆ چركەیەك بیردەكاتە، تۆ كێی من وەهات بۆ دەكەم، كێیت كە من ئارام دەبمەوە پێت. ناكرێت بەم شیعرە بڵێین شیعری نوێی خراپ. چونكە لەگەڵ گۆڕانی سەردەم دا هەمیشە شاعیرانێك، یان عاشقانێك هەن، جوانی پارێزن و بیری ڕەسەن و عەشقی قووڵ بە شیعری سەردەم دەنووسن، ئەگەرچی ئەمانە كەمن، بەڵام هەن!

**موسعەب ئەدهەم: هەست ناکەیت لە ئەدەبیاتی کۆن و کلاسیکماندا ئەوەی شاعیر یان نووسەر وتویەتی، هەر ئەوەشی ئەنجامداوە، واتە نووسین و وتنیان یەکبووە، بەڵام لەئێستادا هەست بە جیاوازییەکی گەلێك گەورە لە نێوان دیوی نووسین و وتە و ڕەفتاردا هەیە، بۆچی؟**

بوشرا کەسنەزانی: تۆزێك لەگەڵ ڕای جەنابتدا نیم، چونکە پێشتریش لە بارەی نالییەوە قسەم کرد، مەرج نییە شاعیر ئەوەی دەیڵێ بیکات، ئیشی ئەو بیرکردنەوە و گوتنە، زۆر کەم کارەکەی دەبێت بە کردار، بۆچی ئەفلاتوون دەڵێت شاعیران ناتوانن ئەوەی دەیڵێن بیسەلمێنن، چونکە هەر بەڕاستی وەهایە، شاعیرانی دێرینیش مەرج نییە هەموو ئەو شتانەی گوتویانە پێڕەوییان کردبێت، دەگمەنە شاعیرانێك نەبێت، کەسانێکی وەك مەولانای ڕۆمی و لای خۆمان مەحوی لە ڕووی عیرفانییەتەوە ئەوەی گوتویانە کردوویانە، بەڵام ئایا بۆ عەشقی تر یان بۆ بابەتی تر، شاعیرەکە نموونەی کەسێکی باڵا بووە لە هەموو ڕوویەکەوە؟ بێ گومان نەخێر. ئێمە کاتێك دەڕوانینە ئەو غەزەلە ئەویندارانەی شاعیرانی کلاسیك دەیانڵێن، هەست دەکەن کۆمەڵگایەکمان هەبووە مێ و ژنی وەك فریشتەی خودایی تەماشا کردووە و خۆشیویستووە و ڕێزی گرتووە، کەچی وەختێك دەچینەوە ناو مێژوو، نەخێر شتی وا نەبووە،

شاعیر له دەمێکدا شیعر بۆ ژن دەڵێت، ژن خەون و خەیاڵیەتی، بەلآم لە واقیع ژن چەوساوەی دەستیانە.

هەم ئەوسا و هەم ئێستاش کەمن ئەو هونەرکار و شاعیرانەی کەسانی ئایدیالی و نموونەیی بن لە زۆر ڕووەوە، بۆ نموونە زۆر شاعیری فارس تەنانەن کوردیش جگەلە عارفەکان، ڕا هەیە کە ئەمانە هۆمۆسێکسواڵ بوون، شاعیری کلاسیکە و ئێمە شیعرەکانی بە ڕۆح و دڵ دەخوێنینەوە. شاعیرمان هەیە دز بووە، یان هەر کارێکی تری ناشرین و دزێو، ئەمانە کاری مرۆڤن نەك شاعیر یان نووسەر، بۆیە ناکرێت ئێمە وەك فریشتەی خودایی بڕوانینە شاعیرانی دێرین و ئەمانی ئێستەش شەیتان، نەخێر بابەتەکە لەوە قووڵترە، ئێمە سەروکارمان لەتەك مرۆڤ دایە، ئەوە مرۆڤە کرداری شتێکە و بیری شتێکی تر، زۆر دەگمەنن لە دونیادا ئەوانەی کردار و گوفتاریان یەك بێت.

**موسعەب ئەدهەم: کە دەقێکی ئەدەبی (شیعر، پەخشان،... هتد)ی کلاسیك دەخوێنینەوە، هەست بە گەرم و گوڕی و دونیایەك عیشق و ڕۆحانیەت دەکەین، بەلآم ئەم شەوق و گەرموگوڕی و تاسەیە لە ئێستا و شیعر و ئەدەبیاتماندا بوونی نییە، هەڵبە گەر ڕاست بێت دەشێ بڵێین ئەمە بۆ ئەدەبیاتی هەموو دونیاش ڕاستە، بە بۆچوونی ئێوە بۆچی بەو جۆرەیە؟**

بوشرا کەسنەزانی: وەڵامەکە سانایە، چونکە مرۆڤی نویٚ ژیانی نوێی دەوێت، ژیانی نوێش لە بنەڕەتەوە تەحەمولی ئەو گەرموگوڕییە ناکات. بەڵام ئەمە بە مانای ئەوە نییە بە ڕەهایی حوکم بدەن کە لە ئێستادا نییە. زۆرن ئەو هونەرمەند و شاعیر و نووسەرانەی لە ئێستاداش هەمان مەیل، هەمان تاسە، هەمان خورپە لە بەرهەمەکانیاندا ڕەنگ دەداتەوە. لە ئێران بڕوانە ئوستاد فەرشچییان، بە چ نەفەسێك مینیاتۆر دەکێشێت، هەر لەوێ بڕوانە خاتوو فەرەح ئسولّی چلۆن نەقاشی ئەویندارانەی سونەتی دەکێشێت، لە نێو ئەدەبیاتدا بڕوانە ئیمبەرتۆ ئیکۆ، بە ڕۆمانی "ناوی گوڵەباخ" چ شاکارێك دەنووسێت لە بارەی گومان و پرسیار و ڕازی وجود لەگەڵیشیدا عەشق و هونەر، ئەو پیاوە کار لەنێو فەلسەفە و عیرفاندا دەکات و بە ڕۆمان بەرهەمی دێنێت. لە تورکیا کەسێکی وەك ئۆرهان پامۆك، "من ناوم سوور" دەنووسێت، تا ئێستا سێ جارم خوێندۆتەوە، چونکە هەستەکەم قسەیە لەسەر ئەو زەمەنەی ئێمە کە وەك نۆستالیژیا حەزمان لێیە و بەڵام هەرگیز نەژیاوین تێیدا، ئەم نۆستالیژیایە لە ڕۆژاواشدا هەیە، بۆ نموونە "ودی ئالێن" فیلمی "نیوەشەوی پاریس" بەرهەمدێنێ تا باسی ئەو وەختانە بکات، کە هەر شتە و تام و مەیلی خۆی هەبوو. لە بیرم نەچێت ئەمین مەعلوف "سەمەرقەند" دەنووسێت، تەواو تۆ دەباتەوە سەردەمی خەییام، لە ناو

کوردیش دا جان دۆست بە نووسینی "میرنامە" باسی عەشقی ڕاوەستاو و گومان و ڕازی ئەحمەدی خانی دەکات. ئەمە بێ لە دەیان نووسەری تری وەك پاولۆ کۆیلۆ، هێرمان هێسە، بۆرخیس، وە هەندێك بەرهەمی ئیتالۆ کالڤینۆ. ئێستە ئەگەر کەسانێك بیانخوێنەوێت دەتوانن بگەڕێن و ئەو بەرهەمانە بدۆزنەوە کە تاسە و خورپەی ڕەسەنی تێدایە. تەنانەت دەتوانن ئەو فیلمانەش ببینن، کە هەر لە باری سەردەمی نوێیەوەیە بەلام تاسەو خوپەی مرۆڤی تێدایە، مرۆڤی بیندار و عاشق. بۆ نموونە فیلمەکانی "کریستۆڤ کیسلۆفسکی" ناکرێت تەماشی بکەیت و بلێیت خورپە و گەرمی تێدا نییە. یان بە شیوە کۆنەکەی دەکرێت بچیتەوە سەر فیلمەکانی "ناسر خەمیر" فیلمی تەوقی حەمامە و بابا عەزیزی ببینت، وە دەیانی تر کە ئێستە بۆم ڕیز ناکرێن.

**موسعەب ئەدهەم: بە بۆچوونی بەڕێزتان میتۆدی مامەڵەکردنمان لەگەڵ دەقە ئەدەبیەکانمان کە تەژین لە مەعنەوییەت و عیشق و ڕۆحانییەت، دەبێت چی بێت و چۆن بێت؟**

بوشرا کەسنەزانی: یەك شت هەیە لە بارەی ئەو جۆرە دەقانەوە، تۆ ناکرێت بە پێوەری ئێستا بیانخوێنیتەوە، ناکرێت دەقێکی مەولانای ڕۆمی بدەیت بە لێکۆڵەرێك، بە میتۆدی دەروونشیکاری لێکۆڵەر ئەم شاعیرە هۆمۆسێکسواڵە! ئەمە جەرگبڕی ئەدەبیاتە.

**موسعەب ئەدهەم: زیندوێتی ئەدەبیات و شیعری کلاسیکی کوردی لە سەردەمەکانی پێشوودا بۆچی دەگەڕێتەوە؟**

بوشـرا کەسـنەزانی: ئـەوەی دەقێکـی کلاسـیکی دەیلێـت، گەوهـەری بیرەکانییەتی، ئـەو گەوهـەرەش ڕەنگدەرەوەی بـیری قـووڵ و پرسـیاری وجودی و عەشقی ڕازدارە، هەموو ئـەم مەسـەلانە شـتانێك نـین کـۆن بـن، دەمیانێ بەسەر بچێت، ئەگەر مەحوی پرسیاری ئەوەی هەبێت "خـودا بـۆ وادەی دیدار بە ڕۆژی قیامەت دەدات؟" کەسێکی عارف ئـەم سـەردەمەش هەمان پرسیاری هەیە، ئەگەر نالی باسی عەشقێك بکات هی ماهـڕووەکان، مرۆڤی عاشق هەمان وێنەی هەیە بۆ یاری خۆی، یان ئەگەر مەولەوی قسە لە بارەی میعراجەوە بکات، کەسێکی ئیماندار ئێستەش بڕوای بـە میعـراج هەیـە. واتــە ئــەو بابەتــە بابــەتی هەنوکــەیی و ڕۆژنامــەیی نییــە، بابــەتی ئینسانی و پەیوەستە بە وجود و بیرە ئاڵۆزەکانی بەنیئادەمەوە، بۆیە تـا ئێستاش بەردەوام دەخوێنرێنەوە. هەندێ جار ئەو شـیعرانە ئەوەنـدە لـە تۆوە نزیکن هەست دەکەی مەحوی، نالی، وەفایی و سالم تۆیان ناسـیوە و بۆ دەردی بێ دەرمانی تۆیان وتووە.

لـە دونیـادا دوور لـە عیرفانییـەتیش شـیعر و دەقـە زینـدووەکان، ئـەو دەقانەن تەعبیری زاتییان هەیە، باس لە حاڵەتی مرۆیی دەکەن، نەك باس لە دیاردە یان بابەتێکی ڕۆژ.

ئەگەر لە بابەتەکە دوور نەکەومەوە، تەماشای شیعری گۆران بکەین وەك پردی پەیوەندی هەر سێ ڕێبازی کلاسیکی و ڕۆمانتیکی و ڕیالیزم، شیعری زۆر لاوازی هەیە بۆ بیرە ئایدۆلۆژییەکەی کە ئێستا ئێمە هەرگیز جارێکی تر نایخوێنینەوە، بەڵام شیعریشی هەیە وەك شیعری دەروێش عەبدوڵڵا، چەندین جار دەخوێنینەوە، دەروێش عەبدوڵلا نەمرە، چونکە شیعرەکە لە بارەی ستوونییە شۆڕبۆتەوە بە ناو مانادا، ئاسۆیی و تەخت نییە، ئەو شیعرە بیری گۆرانە بۆ کەسانی گرنگ، دەی هەمیشە ئەو جۆرە کەسانە هەن، بۆیە شیعرەکەش زیندووە. کەسێکی وەك شێخ ڕەزای تاڵەبانی چەندێك شیعری داشۆرینی گرنگی هەیە، کە بۆ هەمیشەیی ناشێن، بەڵام لە تەکیشی دا غەزەلی وای هەیە، ناکرێت تا ئەم دەقەی وەڵامدانەوەی منیش بە زیندوو دانەنریت، وە بۆ ئایندەش بڕوانە چەندە جوان دەڵێت:

**کارێ کە غەم و دەردی فیراقت بە منی کرد**

**سەرما بە هەتیو، با بە دەواری شڕی ناکا**

ئەمە نموونەی زیندووییە، جا ئەگەر بابەتەکە ورد و قووڵ بکەینەوە بۆ شیعری عیرفانی کە زۆربەی جار شاعیر بە حاڵەتی ڕۆحی پێی گەیشتووە، ئەوە ئەزموونکراوە و شتی ئەزموونکراویش زەمەنبەزێنە. بۆچی ئێستا لە دونیادا تەنانەت لە ڕۆژاواش مەولانای ڕۆمی تاکە شاعیری

ڕۆژهەلاتییە کە زۆرترین خوێنەری هەیە؟ خۆ زۆر جاران دەڵێن کاری سۆفیزمی ئیسلامی بە ڕۆژاوایی ڕاڤەناکرێت، نەك وەك لێکۆڵەر وەك چێژی تاکەکەسی، بەلام لە ڕاستیدا هەمیشە چرکەساتێك هەیە مرۆڤ پێویستی بە قسەکەرێکە بۆ ڕۆحی، ئەو قسەکەرە بۆ شەرق و غەرب مەولانای ڕۆمی یان خەییامە.

# مرۆڤی سەردەمی نوێ بووەتە کاڵای ئابووری!

## گفتوگۆ لەگەڵ "لهۆن قادر"

**موسعەب ئەدهەم: گەر "جوانبینی" یەکێك لە تایبەتمەندی و سیفەتەکانی عاریفان بێت و ئەدەبیاتی کوردیش وەك ئاوێنەیەك کە چەندین عاریف و عاریفی شاعیری تێدا دەبینرێت و، ئەمەش وا بکات ئەدەبیاتی کوردیمان ڕەنگدانەوەی ئەو جوانی و جوانبینییەی تێدا نومایان بێت، بۆچی نەوەکان و ئەدیبانمان لەم سەردەمەدا نەیانتوانیوە ئەو چێژ و جوانبینییە درێژە پێ بدەن؟ یان بە مانایەکی تر بۆ ئێمەی مرۆڤی سەردەمی نوێ بگوازنەوە؟**

لهۆن قادر: عیرفان لەم ناوچەیە زادەی پارادایم و فۆڕمێکی تایبەتی ئایینە، کە لە سیاقێکی مێژووییدا سەریهەڵداوە و گەشەی کردووە، فۆڕمێکی ئایین کە وەڵامدەرەوەی فەراغ و زادەی کۆمەڵێ فاکتەر بووە، عیرفانێك کە لە خودی خۆیدا بە لەخۆدوورگرتنی کەسانێك لە دەرهاویشتە نەرێنییەکانی دەسەڵات دەستپێدەکات، دواتر دەبێتە، عیرفانی تیۆری و نوخبەوی وەکو ئیبن عەرەبی. ئینجا عیرفانی خەشیەتی، کە لای غەزالی وەك نموونە دەبینرێت. دواتر عیرفانی عیشقی، وەك نموونەی مەولانا (کە بە گشتی بەرهەمی شیعری عیرفانی، زادەی ئەم مۆدێل و قۆناغەیە)،

دواجـار عیرفـانی میللـی، کـه عیرفـان بـه بـازاڕی دەکـات. ئـەو جـۆرە جوانبینییە، زادەی ئـەو قۆناغەیـە لـەو پەرادیمـەی ئـایین. ئـەمڕۆ فـۆرمی ئایینی لە ئیسلامی سیاسی و سەلەفییەتدا خۆی دەبینێتـەوە، جـوانبینی لەم سیاقەدا هـیچ مانایـەکی نییـە، ئـایین بووەتـە ئایـدۆلۆژیا، لـەم دیـدە ئایینییەوە دونیا دوژمنە خوا شکستی هێناوەو لەشەڕدایە لەگەڵ جیهـان، بـە پێچـەوانەی عیرفانـەوە کـە خـوا عیشـقە بـۆ هـەمووان و سەرچـاوەی جوانییە. لەدیدی ئایینیی نوێدا مرۆڤی ڕزگارکەری ئایین و خوا پـەروەردە دەکرێـت، وەك داعشـی چـەکدار یـان بێچـەك، نـەك مرۆڤـی جـوانبین. ئینجا ئیتر چۆن چاوەڕێی گواسـتنەوە یـان پەرەپێـدانی ئـەو جوانییـەی عیرفانی! خۆ ئێمە لـەم ناوچـەیە لـە دەرەوەی ئـایینیش بیرکردنـەوەمان نییـە، هێشـتا جیهانبینیمـان نییـە، تـا جـوانبینی لەسـەر بونیـاد بنـێین، عیرفانیش لای ئێمە زادەی ئایین بووە.

**موسعەب ئەدهەم: گەر بە پۆلبەندی جیهانی مۆدێرنە و جیهانی پێش مۆدێرنـە "کـۆن و کلاسـیك" قایـل بـین. بۆچـی لەسـەردەمی نـوێ و تەکنۆلۆژیادا ناتوانین ئەو ئەدەبیاتەی کە لەسەردەمی پێش مۆدێرنەدا هەبووە و چەندانی وەك " مەحوی و مەولەوی و نالی و... هتد" ی بەرهەم هێناوە، لەم سەردەمەشدا مرۆڤی لەوجۆرە بەرهەم بهێنێت؟**

لهۆن قادر: ئەو وەڵامەی پرسیاری یەکەم، بۆ دووەمیش ڕاستە، ئەگەرچی پرسیاری یەکەم بۆ مێژوو و واقعی ئێمە جەختکراوترە. بە هەرحاڵ مۆدێرنە مرۆڤێکی خستۆتەوە کە لە ئەنجامی ڕیزپەری میتافیزیك و ئاییندا، هەموو جۆرە مەعنەویاتێك ڕەددەکاتەوە، یان بە گشتی مەیل و متمانەی بداتە عەقڵانییەت و ئەزموونگەرایی (ئەگەرچی لای ئێمە، واتە لەم ناوچەیە ئەمەش نەبووە و تەنانەت هێشتا کاتی بۆ دروست نەبووە)، بەواتا مرۆڤی نوێ، ئەو قۆناغەی بە جێهێشتووە، بە دەستی خۆی، خۆی سەرقاڵی جەنجاڵی کردووە، ئیتر لێرە مرۆڤ کاتی ئەوەی نییە سەرقاڵی تێکستە دێرینەکان بێت، سەرقاڵی بەرهەمهێنانە، خۆیشی بووەتە کاڵای ئابووری، ئەوە جگە لەوەی لە نوێدا قارەمانەکان، ڕۆحە گەورەکان نین، بزنسمان و سیاسییە سوفستائییەکان و هونەرمەند و وەرزشکارە... هتد. کە ئاراستەی حەشامات ئەکەن و ئەفسانەی سەردەمیان لێ دروست دەکرێت، چیدی هیچکات مەولانا و مەحوی و... هتد، دروست نابن.

موسعەب ئەدهەم: کە ئەدەبیاتی کلاسیك دەخوێنینەوە هەست بە گەرموگوڕی و عیشق دەکەین؟ واتە ئەدەبیاتی کلاسیك زیندووە، بەڵگەی ئەمەش ئەو هەموو هێما و ڕەمزانەی سروشتە کە بەکارهاتوون و ئەمە بەدەر لەوەی کە هەر جیهانبینی جیاواز بووە!

لهۆن قادر: زیندوویەتی شیعر تەنیا لە ناوەڕۆکیدا نییە، کە بابەتی عیشقیش یەکێك لەوانە، شیعر لای کلاسیکەکان جگە لەوەی وەك سناعەتێکی ئەدەبی لێڕوانیوون و هەموو هونەریەتی خۆیان لە سەنعاتکاری وشە و ڕەوانبێژیدا بەخەرجداوە، لە هەمانکاتدا دیدیان بۆ شیعر و بابەتەکانی دەورووبەر جیاواز بووە. شیعر تەنها گەڵای دەربڕین و بەهێزترین ئامرازیش بووە بۆ خستنەڕووی مانا قووڵەکانیان، ئەوە جگە لەوەی زۆرجار لە شاکاریدا دەگەیتە ئەو بڕوایەی خۆی ئامانج بووە. سەبارەت بە عیشق و بابەتەکانی دەورووبەری شاعیر، عیشق پلەیەکی وەرگرتووە کە لەگەڵ عیشقی خوایدا بە ئاسانی جیا ناکرێتەوە، شاعیرە کلاسیکەکان کە بە گشتی هەریەکە و ناوی مەعشوقێك بووەتە بابەتی شیعرە لیریکییەکانی، نازانین خوایە یان مرۆڤ، یاخود بە لایەنی کەمەوە نازانین کێیە. جگە لە عیشق پەیوەندی شاعیری کلاسیکی لەگەڵ سروشت و دەورووبەریدا وەك پەیوەندییە لەگەڵ مەوجودێکی زیندوو، واتە بە مرۆڤ کردنی تێدا دەبینرێت، ئەوە جگە لەوەی گوزارشتی شیعری شاعیری کلاسیکی هەڵقوڵاوی ئەزموونێکی ڕۆحی و سۆزی قووڵە، کە لە قووڵایی نائاگاییەوە دێ و خۆی دەخزێنێتە ناو قووڵایی نائاگایی خوێنەر.

**موسعەب ئەدهەم: دەروونناس و بیرمەندی بەناوبانگ " ئەریك فرۆم" پێی وایە ئێمە کەسێکمان خۆش دەوێت لەبەرئەوەیە خۆمانی تێدا دەبینینەوە، پێت وانیە لەبەرئەوەی ئەدەبیاتی کلاسیك هێندە لە لامان بەرز و جوانە، چونکە خۆمانی تێدا دەبینینەوە؟ بۆچی ئەم ئاوێنەیە لەم سەردەمەدا بوونی نییە و گەر هەبێت بەراورد ناکرێت بە سەردەمی پێش مۆدێرنە؟**

لهۆن قادر: لە وەڵامی پرسیاری پێشوودا، ئەوەم ڕوونکردەوە کە بۆچی کلاسیك زیندووە، بەڵام سەبارەت بە گوتەکەی (ئەریك فرۆم)، من نازانم ئەو لە چ سیاقێکدا ئەوەی وتووە، بەڵام پەیوەستکردنەوەی بەو جۆرە ڕەنگە ورد نەبێت، واتە دەمەوێت بڵێم کەوتنە ژێر کاریگەری بێسارانی، سالم، ئەحمەد موختار جاف، گۆران، هەردی... هتد. بە گشتی لەو ڕووەوە نییە کە من خۆشم دەوێن، هیچ مەرجیش نییە وەك کەسایەتی بیانناسم، یان لەوانەیە کەسانێك سۆز و نۆستالجیایان هەبێت بۆ ڕابردوو یان تێڕوانین و جیهانبینیان بە باگراوندی ئایدۆلۆجی ئەمڕۆی خۆی بزانێت، بەڵام، هیچی لەبەر ئەمانە نییە، شیعر چەندە گوزارشت لە سۆز و هەست و تێڕوانینی مرۆڤانە بکات، بە گشتی زۆرترین گوێگریشی دەبێت، شاکاری جیهانی واتە بۆ مرۆڤایەتی دەدوێت. کلاسیکی ئێمە و ئەم ناوچەیەش بە گشتی زیاتر ئینسانییە، چونکە زادەی عیرفانە کە

سنوورەکانی یەك ئایینیش تێك دەشکێنێت و لەگەڵ مرۆڤدا دەدوێ وەك مرۆڤ و مرۆڤیش خۆی دەبینێتەوە لەم هەستانەدا، بەڵام کاتێك کەسێك بازنەکەی بچوکە و ناتوانێ گەورەبێ، ئەوە ئیتر وشەکانی بە ئەندازەی بازنەی کاریگەربوونەکەی دەڕۆن. ئەوەشمان بیر نەچێت شیعر تەنیا ناوەڕۆك نییە، شێواز و ڕوخسار و ستایلی دەربڕینیشە، شاعیرێك نەتوانێت بیرکەرەوەیەکی گەورە و قووڵ بێت، ناتوانێت خاوەنی ستایلی تایبەتی خۆیشی بێت. شیعری نوێ (بە تایبەتی لای ئێمە) ڕۆژ بەڕۆژ دەستبەرداری ڕەگەزەکانی شیعر دەبێت، بەبیانووی جیاواز، بەڵام هیچ نییە جگە لە سەرەو لێژبوونەوە.

**موسعەب ئەدهەم: عیشق و عیرفان و مەعنەوییەت لە ئەدەبیاتی کلاسیك دەچۆڕێت، بە جۆرێك ناتوانین باسی ئەدەبیاتی کوردی کلاسیك نەکەین گەر بێتو نووری عیرفان و مەعنەوییەت باس نەکەین، تەنانەت گەر پێشمان وابێت دەقەکان خوێندنەوەی عیرفانی و مەعنەوی هەڵناگرن، ئەوا هەر دەبێت ئەو ڕەهەندە فەرامۆش نەکەین؟**

لهۆن قادر: هەروەك چۆن هەموو شاعیرێك، یاخود دروستتر، پێویستە هەر شاعیرێك خاوەنی ستایلی خۆی بێت و هەبوونی ستایلی تایبەت و تایبەتمەندی، بەڵگەی بوون و زەڕووڕەتی بوونی ئەو شاعیرەن، بە هەمان شێوە لە ئاستێکی گشتیدا، قۆناغە جیاوازەکانی شیعریش بە بوونی

ستایلی جیاواز، کراونەتە قۆناغی تایبەت و جیاکراونەتەوە، ئیتر لەڕووی ژانرەوە بێت، فۆرمەوە بێت، ڕێباز بێت... هتد. گرنگ ئەوەیە پارادایمێکی نوێ، کە هەلومەرجێکی تایبەتی کۆمەڵگە دەیخولقێنێت، خولقێنەری ئەدەبێکی نوێیە، ئەگەرچی کارلێك و کارتێکردنەکان دووسەرە و چەند ڕەهەندە. بە کورتی مەرج نییە شاعیرانی سەردەمی پارادایمی عیرفان، هەموویان عاریف بووبن، بەڵام کۆدی زمانی و ستایل و تێڕوانینەکان زادەی هەژموونی ئەو پارادایمە باوەن، بۆ نموونە: بۆ ئەوەی لە مەولەوی باشتر تێبگەی، ئەبێت تایبەتمەندییەکانی سەبکی عێراقی بزانیت، بەڵام مەرجیش نییە مەولەوی بەشێوەیەکی حەرفی پەیوەست بووبێت بەو سەبکەوە. بە گشتی عیرفان جگە لەوەی تایبەت نییە بە ئیسلام، قۆناغ و چەشنیشی زۆرە (عیرفانی تیۆری، دەستەبژێر، تەخویفی، عیشقی، میللی و ڕەشۆکی... هتد).

ئەدەبیاتی عیرفان، زادەی عیرفانی عیشقییە، عیرفانی تەخویفی غەزالی قۆناغی دووەمی خولقاندووە. بەڵام عیرفانی عیشقی مەولانای خولقاندووە، وەکو وتم کۆی ئەدەبیاتی خولقاند و، بە دەربڕینێکی تر و بەڕای متوازعانەی من، ئەم ناوچەیە لە مێژوویدا یەك شتی هەبووە کە پێشکەشی مرۆڤایەتی بکات، ئەویش ئەدەبیاتی عیرفانییە کە زادەی دیدی عیرفانە.

**موسـعەب ئەدهـەم: بۆچـی ئـەدەبیات و نووسـینی ئێسـتامان بەشێوەیەکی گشتی ئەو ناسکی و ڕۆحەی تێدا نابینرێت، گەریوونیشی هەبێت هەوڵی تاکەکەسین و وەکو پرۆژەیەکی گەورە کاری لەسەر ناکرێت؟**

لهۆن قادر: کاری گەورە، بەرهـەمی پـەروەردەی گەورەیـە. سـەردەمی نویٚ، سەردەمی بە بازاڕیکردن و بە حەشاماتکردنی شـتەکانە. سـەردەمی فاست فووتە، مرۆڤی ئەم سـەردە دەیـەویٚ مەعریفـەش بـە فاسـت فـووت بکات، کە بێگومان ناکریٚ، بۆیە کە ناتوانیٚ گەورە بیر بکاتەوە، شتەکانی دەورووبـەری بچـووك و ئاسـان و کـورت دەکاتـەوە. مزگـەوتی ئێسـتا پەروەردە و فێرکردنی تێدا نییە، بۆیە ئیسلامیی ئایدۆلۆجی دەخاتـەڕوو، چاوەڕیٚ ناکریٚ (مەولەوی) بخاتەوە. بێگومان ئـەوە بـەو مانایـە نییـە کـە تروسـکایی نییـە و لـە هـیچ شـوێنێك کـاری بـاش و جـوان نییـە، نـەخێر بێگومان هەیە، بەڵام بزانە لەو شوێنەیە کە پەروەردە و پەروەردەی عەقڵ هەیە. تایبەت بەم ناوچـەی خۆشمـان دوا تێبینـیم بـیر نەچـیٚ، کـە کـاری گەورە لێرە هەر شەخسـی و کەسـی بـووە و هیچـکات نەبووەتـە حاڵـەتی گشتی. داهێنان و خولقاندن و گەورەیی عەقڵ و بەرهەم لێرە نامۆ بووە و

نامۆیە، مەحوی و غەیری مەحوی لێرە نامۆ بوون و حاڵەتی شازن لەم کۆمەڵگەیانەی ئەم ناوچەیە.

**موسعەب ئەدهەم: چی وایکردووە دەقێکی کلاسیك ئەو هەموو خوێندنەوەیە هەڵبگرێت، واتە دەشێ فرە خوێندنەوەیی بۆ دەقی شاعیرێك بکەین و لەگەڵ هەر خوێندنەوەیەکیشدا کۆمەڵێك گەوهەر و مرواریمان دەست بکەوێت، بەڵام ئەم فرە ڕەهەندییە بە گشتی لە دەقێکی نوێدا کە لەم سەردەمەدا نووسرا بێت نابینرێت و هەڵگری تەنها خوێندنەوەیەکە.**

لهۆن قادر: شیعر و زمانی شیعری یاخود هونەر بە گشتی، ئاستی جیاوازی دەربڕینی هەیە. شاعیر لە بابەتی ڕۆژانەدا وەك خەڵکی و بە زمانی باوی خەڵکی دەدوێت، تاکو ئەو کاتەی شتێکی ناباو دەبینێ، یاخود پەی پێدەبات و دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو بابەتە ناباوەوە، دواتر مرۆڤ فیترەتی خۆی وایە کە هەوڵدەدات کەسانی دیکە بەشداری پێبکات لە هەستەکانیدا، بۆیە پەنا دەباتە بەر زمان، بەڵام زمانی ناباو، چونکە خودی بابەتەکە خۆی ناباوە و بە زمانی باو دەرنابڕدرێت، لێرەوەیە زمانی شیعری و هونەرە جوانکارییەکانی ڕەوانبێژی و ڕوونبێژی دێنە کایەوە و ڕۆڵی خۆیان دەبینن، واتە زمانی شیعر کە زمانی ناباوە یاخود خواستنە، دەبێتە دەربڕی بابەتە ناباوەکە و ئەو ئەرکە سەختە لە

ئەستۆ دەگرێ و لە ڕاستیشدا جگە لە شیعر، مرۆڤ شتێکی تری نییە تا بەو شێوە گوزارشتی خۆی پێبکات. بێگومان یەکێك لە جوانییەکانی دەربڕینیش ئیبهام، ئاڵۆزی یاخود فرەواتاییە، کە ئەمە نەمری دەداتە شیعری شاعیرێك کە خۆی ئاسۆی بیرکردنەوەی زۆر فراوانە و لێوڕێژە لە مەعریفە و بەناچاری پەنا دەباتە بەر دەربڕینێك کە زۆرترین ماناکانی خۆی لێرەوە بگەیەنێت، هەروەك بۆ نموونە: لە تابلۆکانی لیۆناردۆ داڤنشی (ئیتر تابلۆی مۆنالیزا بێت، یاخود دوا ژەمی ئێوارەی مەسیح)، کە بە دەیان ڕاڤە و لێکدانەوەی بۆ کراوە کە ئەوەش بەڵگەی قووڵی خاوەنەکەی و فراوانی ئاسۆی بیرکردنەوەی و هێزی جوانی دەربڕینیەتی. بەڵام لە سەردەمی نوێدا مرۆڤ هەوڵی خۆ قوتارکردن دەدات لە هەموو ناباو و ئاڵۆزییەك، مرۆڤی ئەم سەردەمە حەوسەڵەی خۆماندووکردنی نییە، سەردەمی فاست فووتە، هەموو شتێ بە حازری و خێرایی دەوێت. بۆیە نە شاعیری قووڵ و نە خوێنەری خۆماندووکەر لە تایبەتمەندییەکانی ئەم سەردەمە نین.

**موسعەب ئەدهەم: گەر سەردەمی بەرهەمهێنانی ڕەمز و مرۆڤی مەزنی ناو شیعر و ئەدەبیات بەسەرچوو بێت؟ چ شتێك جێگەی ئەوە دەگرێتەوە، لە بنەڕەتدا ئامانجی ئەدەبیات بە گشتی و شیعر بە تایبەتی لە ئێستا چییە و چ ئەرکێکی هەیە؟**

لهۆن قادر: سەردەم، ئامێرێك نییە تا لۆمە بكرێت بۆچی مرۆڤی گەورە ناخاتەوە، بە پێچەوانەوە، مرۆڤی گەورە سەردەمی گەورە دەخولقێنێ. شیعریش بەهەمان شێوە، كە سیفەتی گەورەی بدەینە پاڵ، واتە خولقاوی دەستی مرۆڤی مەزنە، سەردەم و شیعر لێوانلێو بێت لە حەشامات، ئیتر چۆن سەردەم و شیعری گەورە دەخولقێ تا جارێكیتر چاوەڕێ بین مرۆڤ و شیعر و تێكستی مەزن بخولقێنن بە پەروەردەكردنیان!

ئەدەبیات ئامانجێكی نییە لە دەرەوەی كۆمەڵگە، وەك دەوترێت ڕەنگدانەوەی كۆمەڵگەیە، چ بچێنی، ئەوە دەدوورێتەوە. بە تایبەتی لای ئێمە، هیچ كایەیەك دەبینی هیچ جۆرە ئامانجێكی هەبێت؟ من نایبینم. بۆیە ئەدەب و هونەریش زمانحاڵی ئەو پوچگەراییە (نەهیلیزم)ـەیە كە واقیعی تەنیووە و باوە.

**موسعەب ئەدهەم: بۆچی وێنە و وێنەگەری تاكو ئاستی تەواو ڕووكەش لە دەقی نوێدا دەبینرێت، كەچی بە پێچەوانەوە ئەو وێنەیەی كە پێشتر بوونی هەیە و لە دەقی كلاسیكدا دەیبینین لەگەڵ ئەوەی وێنەشن، بەڵام قووڵترن و زیهن و بیرمان بۆ جێگای دیكە و پرسیاری دیكەی قووڵی فیكری و فەلسەفی دەبەن؟**

لهۆن قادر: وێنەی شیعر، تایبەتمەندی زۆر هەن كە دەبنە پێكهێنەری، هەندێكیان مۆتیڤی پشت دروستبوونن و هەندێكیشیان پۆلێن و چۆنیەتی

کەوتنەوەن دوای دەرکەوتنیان لە شیعرەکەدا، لەوانە: تێڕوانین و دیدی شاعیر، حاڵەتی دەروونی، قووڵی و ڕووکەشی، بە مرۆڤکردنی غەیری مرۆڤ لە گیاندار و بێگیان و بە پێچەوانەوە، هەروەها چۆنیەتی کەوتنەوەی وێنە شیعرییەکە وەك یەکێك لە هونەرە ڕەوانبێژییەکان، لەوانە لێکچواندن، خوازە، خواستن، درکە... هتد. کە من بەڕاستی گومانم هەیە شاعیرانی نوێ، قووڵ و قاڵ بووبنەوە لەو هونەرانەدا لە کاتێکدا شاعیرانی کلاسیك مەرج و سنعەتکاری بووە لایان، کە ئەو هونەرانە لە شیعرەکانیاندا بنەخشێنن. شاعیری نوێ، هەموو ئەو هونەرانەی بە کۆت زانیووە و فۆرمێکی سانا تری بۆ شیعر گرتووەتە بەر، چونکە نەخۆی جیقەڵدانی ئەو فلتەرانەی هەیە و نە خوێنەرەکەشی نەفەسی خۆماندووکردن. شاعیری کۆن، بە تەوازوعەوە چووتە خزمەت ئەزموونەکانی پێش خۆی و سەردەمی خۆیشی، جارێکیتر و فۆرمی ئەزموونێکی نوێی شیعری خولقاندووە، بەڵام شاعیری نوێ چوار شیعر ناخوێنێتەوە و دەبێتە خاوەن دیوان! ئاخر تۆ ئەگەر بشتەوێ لە نانەوایەك ئیش کەی، خۆدەبێت بۆ هەفتەیەکیش بێت ئەزموون وەرگری. شاعیر و شیعری نوێ زۆر مەرجی جوانکاری شیعری بە ناوی نوێ و ئازادەوە خستووەتە لاوە (بێگومان ئێمە باسی شیعری ئەم چەند دەیەی ئەزموونی شیعری کوردی دەکەین)، لەوانە هونەرە ڕەوانبێژییەکان، مۆسیقای شیعری،... هتد.

تەنیا ڕەگەزێك بەزەقی مابێتەوە، وێنەی شیعرییە، ئەگەر نەڵێم شیعری ئەمڕۆ تەنیا وێنەیە، ئەویش وێنەیەکی سادەی ڕووکەش کە هیچ سوپرایز و چێژێکی ئەوتۆ ناداتە خوێنەر.

**موسعەب ئەدهەم: گەر ڕووکەش و ڕووکەشگەرایی سیفەتێکی سەردەمی نوێ بێت، ئەمەش قسە گەلێك لە بیرمەندەکانە لەمەڕ چییەتی سەردەمی نوێ، ئایا ئێمە دەتوانین لە دەقی کلاسیك تێبگەین وەکو ئەوەی کە پێویستە؟**

لهۆن قادر: شیعر هەرچەندە دەربڕینێکی خودی بێت، ئەوەش لە چەشنێکی وەك لیریکەوە ڕێژەکەی زیاتر و جیاوازە تا شیعری درامی و فێرکاری و چەشنەکانی دیکە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێت لە پەیوەندیدا نەبێت لەگەڵ کۆمەڵگەدا، واتە بەرهەمهێنانی شیعر لە هەمانکاتدا کە گوزارشتێکی خودییە، کارێکی جڤاتیشە. بۆ نموونە شاعیر ئەو زمانەی بەکاریدەهێنێت بۆ دەربڕینەکانی لە (وشە، دەستەواژە، ڕستە، لێکچواندن، خواستن و خوازە، سیمبول و ئەفسانە و... هتد)، هەموو ئەمانە لە دەرەوەی تێگەیشتنی ئەو کۆمەڵگایەوە نین کە شاعیر بۆی دەنووسێت و لە هەمانکاتدا بەرهەم و دەرهاویشتەی سەردەمانێك لە بیرکردنەوەی مرۆڤەکانی ئەو کۆمەڵگایەن. پارە، کە ئێمە ڕۆژانە مامەڵەی پێدەکەین لەگەڵ کەسانێکدا کە هیچ نایانناسین، بەلام لەبەرئەوەی ئەو

پارچە وەرەقەیە کۆمەڵگە ئیعتیباری پێداوە، کەسەکەی بەرامبەرمان متمانەمان پێدەکات و کاڵایەکمان پێدەدات، واتە ئیعتیباردان بەو پارچە کاغەزە بێت ئەرزشە لە کۆ هەست و نەستی جڤاتدایە، وشەکان و کەرەسەکانی زمانیش بەهەمان شێوەن، ئەگەر لە جڤاتدا مانادار نەبن و جڤات مانای پێنەدابن، با شاعیر هەر بۆ خۆی وشە ڕیز بکات. لێرەوەیە کە تێگەیشتنمان لە دەقێکی کلاسیک، وێڕای ئەوەی پێویستی بە گەڕانەوە هەیە بۆ مانا فەرهەنگی و مەجازییەکانی وشەکان، لە هەمانکاتدا شارەزابوونی دەوێت لە پۆینتەکان و سەرچاوە جیاجیاکانی مەعریفە، بێگومان ئەمە بۆ کەسێك کە بیەوێ خوێندنەوە بکات بۆ دەقێکی کلاسیك نەك بیخوێنێتەوە، چونکە یەکەمیان لە مەعریفەوەیە و مەعریفە نوێدەکاتەوە، بەڵام دووەمیان وێنە ئەبینێ و وەك ئامێرێکی کۆمپیوتەر ناتوانێ هیچی لێ بەرهەمبهێنێ. لە لایەکی دیکەوە مرۆڤی ئێستا وەك پێشتر باسمانکردووە لەدووی ئاسانکردنە، کە ڕاگەیاندن و ئایین و سیاسەت و پەروەردە و هونەر و... هتد. حەشامات دەخولقێنن، کە ئەمجۆرە مرۆڤە حەشاماتییە زیاتر لە باوباپیرانی پێشووی ڕقی لە بیرکردنەوەیە. کەواتە تێگەیشتن لە دەقی کلاسیك بەو جۆرەی کە پێویستە پرۆسە و پەروەردەیەکی نائاسایی و نائاسانە، ئەوانەی دەتوانن حەق بەم کارە بدەن کەمن و ڕیزپەڕن.

**موسعەب ئەدهەم: "ڕاز" و "ڕازئامێزی" یەکێکە لەو چەمکانەی دەشێ لە زۆرترینی دەقە کلاسیکییەکاندا هەستی پێ بکەین و گەلێك جار بەکارهاتووە، بۆچی ئێستا ئەو ڕازە بوونی نییە؟**

لهۆن قادر: وەڵامی چەند پرسیارێ پێشتر، بە جۆرێك وەڵامی ئەم پرسیارەشی تێدایە. بەڵام ئەگەر بمەوێ شتێك ئیزافە بکەم، ڕاز، سیمبول، مەجاز، بە گشتی زمانی لادەر لە زمانی فەرهەنگی و ڕۆژانە، زمانی کەسانێکە کە سەر ڕێژن لە زانین و پەیبردن بەو شتانەی لای خەڵکی ئاسایی و دەرئەنجامی نەزانینی خۆیان، نەزانراوە و شاراوە ماوەتەوە، بۆیە پەنایان بردووەتە بەر ڕەمز و ڕاز و سیمبول و زمانی مەجاز، بەڵام مرۆڤی ئێستا هەوڵی خۆتێکەیاندن لە ڕازەکان نادات، بەڵکو سەردەم، سەردەمی شەفافیەتە، مرۆڤی شەفاف و هەموو شتێك شەفاف. مرۆڤی ئەمڕۆ ڕازی نییە، بەشێك و نیسبەتێکی بەردەستبوونی ئەو زانیارییانەیە کە ڕۆژانە مرۆڤ پێویستیەتی و بەشەکەی دیکەشی مرۆڤ حەوسەڵە و نەفەسی چوونە ناو جیهانێکی نا ڕوونی نییە.

**موسعەب ئەدهەم: : ئایا ئەو مامەڵەیەی کە هەندێك نووسەر و لێکۆڵەر دەیکەن (مامەڵەکردنێکی ڕووکەشییانە و خوێندنەوەیەکی مادییانە) لەتەك دەقە کۆن و کلاسیکییەکاندا مامەڵەیەکی دروستە و دەمانگەیێنێتە ئاستێك بەرەوڕووی کردنەوەی وەڵامی پرسیار و نهێنییەکانی دەقەکان؟**

لهۆن قادر: له مامەڵەی ڕووکەشانە تێدەگەم، بەڵام نازانم مەبەستت لە مادییانە چییە! بەڵام من پێم وایە زیاتر مامەڵەیەکی ئایدۆلۆژیانەیە. بۆ نموونە مامۆستای گەورەمان (د. عیزەدین موستەفا ڕەسوڵ) (یادی نەمرییێت)، لە کتێبی (الواقعیە فی الادب الکردی)دا، گەشەی ئەدەبی کوردی لەسەر هێڵی گەشەی قۆناغی دەرەبەگایەتی بەرەو سۆسیالیزمی کۆمەڵگەی کوردی دەبەستێتەوە! کاکەی فەلاح سەر بنەمای ئایدۆلۆژیا شاعیران دەخوێنێتەوە و لەسەر ئەو بنەمایە پیرەمێرد کۆنەپەرستە و کەسانی دیکە پێشکەوتووخواز و هەر لێرەوە ئەو دەنگە نەشاز و نوزە شەرمنانەمان گوێلێدەبێت کە (قانع) چەپە و (موفتی پێنجوێنی) فێمێنستە! بە هەمان شێوە ئایدۆلۆژیای ئیسلامی سیاسی پێمان دەڵێت: هەموویان لە سەربازگەکەی منن، چونکە دەرچووی مزگەوتن و دانە پاڵی هەندێ ئایدیا بۆ ئەوان، لەوانە عیشقی حەقیقی و دڵداری ئینحرافە لە بیرکردنەوە و لێرەوە ڕابردوو هی منە و ئایندەش هەر بۆ منە! ئەوە بگوزەرێ لەوەی هەندێکی دیکە (مستەفا بەگی کوردی)مان لێدەکەنە هەتیوباز، هەروەك چۆن (مەولانای بەڵخی) بە لیدەری هۆمۆسێکسواڵەکان دەزانن! ئەمانە هەموو ورێنەی میتافیزیکییانەن، بۆ ئەوەی ئەمە تێپەڕێنین (لای ئێمە نا، چونکە لای ئێمە هێشتا هەنگاوە سەرەتاییەکانیشمان نەناوە)، چەندین قوتابخانەی ڕەخنەیی وەك

فۆرمالیست، بونیادگەری و بونیادگەری وەسفی دروستبووە تا مامەڵەکردن لەگەڵ دەقدا بهێننە ناوەوە کە بەڕێزت ناوتناوە (مامەڵەی دروست). دەرئەنجام ئێمە مامەڵەی دروستمان نەکردووە و، ئیتر هیچ ئاسۆیەکیش لەوێ، لەوێیەکی وەهەم ئاسا نییە تاپێی بگەین. هیوا و ئاسۆیەك هەبێت لێرەیە کە ئێمە مامەڵەی میتۆدی و زانستی بکەین لەگەڵ نووسین و تێکستەکانماندا، تا ئەوکات ئەبدەیتی مەعریفەمان بکەینەوە و شتی نوێ بخولقێنین، کە نیمانە و هەر ئەڵێین، دەبێت بەڵگە و میتۆد بێت، کەواتە ئەمەی هەیە لە خولانەوە بە دەوری بازنەی خاڵی و مانەوە بە نەزۆکی، بەرئەنجامی ئەوەیە و شێواندنی ئەوانەی پێشوویشی بەدوای خۆیدا هێناوە.

**موسعەب ئەدهەم: بە بۆچوونی بەڕێزتان میتۆدی مامەڵەکردنمان بۆ خوێندنەوەی دەقە کلاسیکی و شیعری شاعیرە مەزنەکانمان چی بێت؟**

لهۆن قادر: ئەگەر باسی کتێبەکانی دەرەوەی زانکۆکان بکەین کە خوێندنەوەی کردووە بۆ شاعیران و ئەدەبیاتناسی بە گشتی، ئەگەرچی دەبینین جەختی لەسەر لایەنی مێژوویی یاخود دەروونی یاخود ئایدۆلۆژیی ئەو ڕەهەندانەیە، بەڵام هیچ خۆی پەیوەست نەکردووە بە میتۆدێکەوە و بە گشتی خۆی ئازاد بینیوە کە چۆن دەنووسێت، بنووسێت. سەبارەت بەو نامەی ماستەر و دکتۆرایانەی کە لەزانکۆکانمان

نووسراون لەوبارەوە، زیاتر میتۆدی مێژوویی و وەسفین. بە نموونە (نالی) یاخود هەر شاعیرێکی دیکە کەی ژیاوە، مەلا بووە و لە کوێ مەلا بووە، پیرەمێرد نەتەوەیی و دیلان و گۆران شیوعیبوون، مەلای گەورە و موفتی پێنجوێنی فێمێنست بوون! ئەمانە ئەگەرچی زانیاری بۆ ئێمە کۆکردبێتەوە، بەڵام کایەی مەعریفەی نەوروژاندووە، واتە مەعریفەی نوێی بەرهەم نەهێناوە. بە ڕای من گونجاوترین میتۆد، بونیادگەری وەسفییە، کە مامەڵە لەگەڵ دەقدا دەکات وەك دەق، بەڵام وەك بونیادگەرە داخراوەکان نا، بەڵکو کراوە یاخود وەسفی، بە جۆرێك لە کوێدا پێویست بوو دەگەڕێتەوە بۆ ڕەهەندە مێژوویی، دەروونی، کۆمەڵایەتی، ئابووری... هتد، بەڵام ئەوەش کەی ڕەوتی زانستی توێژینەوەکە خواستی.

**موسعەب ئەدهەم: پەیامی عاریفان و ئەدیبانمان "مەحوی و مەولەوی و ... هتد" بۆ سەردەمی نوێ چییە؟**

لهۆن قادر: عاریفان وەك سیاسی و مەزهەبی نوێ نەبوون، کە وێڕای ئەوەی هیچیان پێ نییە بۆ سەردەمی خۆیان، ئیدیعای هەڵگری پەیامداربوون بکەن بۆ ئایندە! عاریف لەوە زیاتر قەدری خۆی و زانین دەزانێ، بۆیە هیچکات باوەڕی بەوە نەبووە کە دەزانێ، تا زانینەکانی هەناردە بکات بۆ سەردەمانی دواتری خۆی. ئەسڵەن عاریفبوون هیچ نییە

جگە لە پەیبردن بە نەزانینی خۆت. بەڵام لەڕوویەکی ترەوە، عاریفەکان گینگڵیان لەگەڵ پرسیارە نەمرەکانی مرۆڤ خواردووە و عەودالّی دەستکەوتنی وەڵامەکان بوون، بۆیە سوختەیی بوون دەستپێکی ڕێگاکەیان بووە. پرسیارەکە ئەوەیە، ئایا مرۆڤی نوێ ئەو گینگڵ خواردن و خەمەی هەیە؟ ئایا ئەسووتێ بۆ ئەوەی بزانێ؟ ئایا هەڵگری پرسیارە نەمر و بنەڕەتییەکانە؟ من واینابینم وەڵامی هیچکام لەم پرسیارانە بەڵێ بێت. مرۆڤی نوێ تەنیا توانیویەتی وەسف و ئیعجابی خۆی بەرامبەر ئەوانە دەربڕێت، ئەویش نەك دەرئەنجامی تێگەیشتن لێیان، بەڵکو بە سازکردنی دیدار و کۆنفرانس بێت، مانا و پڕ لە پیاهەڵدان یان بە دروستکردنی پەیکەری خالّی لە هونەری جوان و بە ئامانجی پارە خواردن، یان سێلفیگرتن لەگەڵ دیوانەکانەکانیان بۆ پۆزی سەر فەیسبووك. بۆیە هیچ ئامازە و نیشانەیەك لە نێوان ئەوان و نەوەی نوێدا نییە، ئەوەی هەیە وەهمە نەك حەقیقەت و جەوهەری ئەوان.

**موسعەب ئەدهەم: ئێمەی نیشتەجێبووانی سەردەمی مۆدێرنە چۆن سوود لە میراتی مەزنی مەزنەکانمان وەردەگرین؟**

لهۆن قادر: تا ئێمە لە فکری ئەوەدابین بە چەمکی (سوودوەرگرتن) مامەڵە لەگەڵ ئەواندا بکەین، بەڵگەیە کە ئێمە نازانین لەگەڵ چیدا سەرووکاریمان هەیە. سوودوەرگرتن ستراتیژی مرۆڤی مۆدێرنەیە کە

ئـابووری ئاڕاسـتەی بیرکردنـەوەی دەکـات، بـەڵام مـن دەزانم مەبەسـتی بەڕێزت لە چەمکی سـوود ئـەو ڕەهەنـدە ئابوورییـە سـوودگەراییە نییـە، بەڵام ئەوە حاڵی هەموومانە لە مۆدێرنـدا کـە زمـان گۆیـای حەقیقەتمانـە. ئەوەی کە هەیە لەوێ، هەڵەین ئەگـەر بیربکەینـەوە و بیهێـنین بـۆ ئێـرە، یاخود مرۆڤی لەو چەشنە کۆپی بکەین یان ئێرە بـەرین بـۆ ئـەوێ، بـەڵکو ڕێگـا چـارە ئاسـانە، ئـەویش ئەوەیـە جـارێکیتر ئـەو پرسـیارە نەمرانـە بخولقێنینەوە، کە نازانم چی ڕوودەدات، بەڵام مرۆڤایەتی بـۆ گەیشـتن بـە ئامانجە نەمر و باڵاکانی لەوە زیاتر ڕێگای نییە و ئەوەش بێ باج نابێت.

**موسـعەب ئەدهـەم: پەیوەنـدی ئـایین و ئـەدەبیات چـییە؟ خـاڵی لێکچوونیان لە چیدایە؟**

لهۆن قادر: لێتێکچوونێك هەیە لەوەی کـە ئـەدەبیاتی کلاسـیکی ئێمـە بۆیە جوانە، چونکە ئایینی لە پشتەوەیە، بێگومـان هەڵەیـە، بـە بەڵگـەی ئــەوەی فــۆرمێکی دیــدی ئــایینی ســەد ســاڵە لــە پشــت ئیســلامی سیاسییەوەیە، لە کاتێکدا لە شوعییەت خـراپتر هونـەری خەسـاند، ئـەوە جگە لەوەی نموونەی زۆری ترۆپکی هونەری پڕ لە ئێستاتیکایت هەیە، کە هیچ ئایینی نییە و بـەڵکو و ئـەنتی ئایینییـە. ئـەم هەڵەیـە لـە کوێوەیـە؟ وەڵام ئەوەیە: لێتێکچوونێك هەیە لـە نێـوان مەعنەوییـەت و ئـایین یـاخود ئاییــنداری، کـە واتێگەیشـتووین مرۆڤـی مەعنــەوی ئایینییــە و ئــایینی

مەعنەوییـــە! ئەمـــەش لـــە هەڵـــە پێناســـەکردنی مەعنەوییەتەوەیـــە.

مەعنەوییـەت و مەعنـەویبوون، واتـە مرۆڤێـك وەك مرۆڤبـوون، هـەڵگری پرسیارە نەمرەکانی: لەکوێوە هاتووم، بۆ کوێ دەڕۆم، بۆچی؟ واتـە بـەم پرسیارانەوە گینگڵ دەخوات و عەودالّی دەسـتکەوتنی وەڵامـە، بێگومـان فۆرمێکی ئاین کە عیرفانە، هەڵگری ئەم چەشنە پرسیارانەیە، بەڵکو هەر ئەم پرسیارانەیە و ئەمەش ئەدەبیاتی عیرفانی بەرهەمهێناوە و" دواتریش هـەر هـەڵگرانی ئـەم پرسـیارانە هونـەری باڵایـان بـۆ بەرهـەم هێنـاوین بـا عـاریفیش نـەبووبن، بـەڵام وەك وتم هـەڵگری پرسـیارە نـەمرەکان بـوون، مەعنەوی بوون، بەڵام مەرج نییە ئایینی بووبن، چونکە هـەموو فـۆرمێکی ئایینی مەعنەوی نییە و هەموو مەعنەوییەکیش ئایینی نییە.

**موسـعەب ئەدهـەم: ڕەنگدانـەوەی ئـایین لـە شـیعر و ئـەدەبیاتی کوردیماندا چۆنە؟ ئایا ئەو پەیوەندییە ئیستا لە کاڵبوونەوەدا نییە؟ گەر وایە هۆکارەکەی چییە؟**

لهۆن قادر: وەڵامی پرسیاری پێشوو، وەڵامە بۆ فۆرمێك لە ئایین کە لە ڕابردوودا لە شیعری کوردیماندا ڕەنگی داوەتەوە. بەڵام لە ئێستادا چۆنە، ئەوە سەرپێیانە سەیرێکی شیعرەکانی (موفتی زادە، کۆساری، مامۆسـتا جوتیار، مەلا کرێکار، م. جمال بێدار، م. ئـەبوبکر کـاروانی، م. وەرزێـر و م. نەبەز هەورامی و... هتد)، هەموو ئـەم بەڕێزانـە بکـەیت (چـونکە ئـەم

فۆرمە ئەمرۆ نوێنەرایەتی دیدی باو بۆ ئیسلام دەكات)، دەبینیت كە هەر بەرێزێكیان وێڕای تایبەتمەندی خۆیان و بوونی جیاوازی، لەوەدا هاوبەشن كە شیعریان كردووەتە پەیامێكی سیاسی و ئایدۆلۆژی كە هەركامیان بە ئەندازەی هەڵگربوونیان بۆ ئەم دوو پرنسیپە، بالانسی ئیستێتیكاییبوون لە شیعرەكانیاندا دابەزیووە و پێویست بە خۆماندووكردن ناكات، تا پەی بەوە بەرین كە كاریگەرییان لەسەر واقیع چەند بوو، چونكە لە ڕووی هونەری ئیستێتیكای شیعرییەوە نەك مەرجەع نین، بەڵكو كاریگەریشیان نەبووە و نییە، لە ڕووی فیكریشەوە هەڵگری ئایدیایەكن كە بە شیعریش نەبوایە جەماوەرەكەیان هەر چەپڵەبارانی دەكردن، بە تایبەتی ئەوان خولقاون تاكو هونەری ئیسلامی ڕەسەن بخەنەڕێ، كە ئەوە جێگەی پرسیارە لەسەر ئیسلام، بۆچی تا ئێستا هونەری نەبووە؟ یان ناڕەسەن بووە! بەم نموونانەی دوایی ویستم بڵێم، ئاین بەم فۆڕمە لە كاڵبوونەوەدا نییە، بەڵكو هیچكات هێندەی ئێستا هەژموونی بەسەر كۆمەڵگەدا نەبووە، بەڵام هونەر و هونەری شیعریش لەو نێوەندەدا لە سەرەولێژبوونەوەیەكی بێوێنەدایە. كەواتە ئاین لە كاڵبوونەوەدا نییە، مەعنەوییەت و پرسیاركردن و فیكر و هونەر و ئەدەب لە كاڵبوونەوەدایە، دەرئەنجامی فۆرمی یەقینگەرایی ئایدۆلۆژیستی ئایینی، كە بە مەزەندەی زۆر ئاییندە بۆ ئەوە.

# "بەرهەمەکانی ئامادەکار"

## چاپکراوەکان

### زنجیرەی فیکر:

١- شارناسی و شارسازی، تەحسین حەمەغەریب. ئامادەکردن، سالی ٢٠٠٩.

٢-نەتەوەناسی، ن. تەحسین حەمە غەریب، ئامادەکردن. سالی ٢٠١٠.

٣-ئەرستۆ، ن:پ.ستراتیرن، وەرگێران، ژیانی فیکری و فەلسەفی، سالی٢٠١٠.

٤-ئیسلامی کوردی و..تەحسین حەمەغەریب، ئا: موسعەب ئەدهەم، ٢٠١٣.

٥-فەلسەفە چییە؟ فەیلەسوف کێیە؟ ، ئامادەکردن و وەرگێڕان، ٢٠١٦.

٦-جوانی و ناشیرینی، فەلسەفە بۆ لاوان، وەرگێڕان، ,٢٠١٩

٧-پەنجەرەکانی ژیان، ئامادەکردن و وەرگێران، ,٢٠٢٠

٨- دیموکراسی و مافی مرۆڤ، کۆمەڵە وتاری فیکری . وەرگێڕان،٢٠٢٠

### زنجیرەی ئەخلاق و مەعنەوییەت

١-دیوی ئەخلاقی رێکخراوە مەدەنییەکان. ئامادەکردن، سالی ٢٠٠٧.

٢-عیشق گەورەتر لە عیشق! نووسین، چاپی دووەم، سالی ٢٠٠٩.

٣-ئایا ئادەم نەیبینی؟ ن. جبران خەلیل جوبران. وەرگێڕان،سالی ٢٠١١.

٤-بۆچی ترس لە مەرگ؟ ن: مهاتما گاندی. وەرگێران، چاپی دووەم، ٢٠١٢.

٥-ئەخلاق و مەعنەوییەت، کۆمەڵە نووسەر، موسعەب ، فاتیمە ئەدهەم، ٢٠١٣.

٦-ئەخلاق و فەزیلەت، ن. د.ئارەش نەراقی، وەرگێڕان، ٢٠١٣.

٧- ئایین و مەعنەوییەت، موستەفا مەلەکیان، وەرگێڕان. ٢٠١٦.

٨- موناجاتنامە، خواجە عەبدوڵلای ئەنساری، وەرگێڕان، ناوەندی ڕێنوێن، ٢٠١٩.

٩- عیشقنامە، لێکۆڵینەوە، نووسین، ٢٠١٧.

١٠-ژنانی عاریف و سۆفی، وەرگێڕان، ناوەندی سارا، ٢٠١٩.

١١- هیچ کەس مەعشوقی تۆیە، د. عیرفان نەزەر ئاهاری، ڕێنوێن، ٢٠١٩.

١٢- عیرفان، باغێك لە حەقیقەت، نووسین، ناوەندی سارا، ٢٠١٩.

١٣-نیگایەك بۆ ئەخلاقناسی، نووسین، ناوەندی زەهاوی بۆ فیکر، ٢٠١٩.

## زنجیرەی مەولانا ناسی

١-گوڵستانی مەولانا، ئامادەکردن و وەرگێڕان، ٢٠١٦.

٢- ئایینناسیی مەولانا، د. عبدالکریم سروش، وەرگێڕان، ٢٠١٦.

٣-سوڵتانی عیشق، نووسین، لەمەڕ ژیان و هزری مەولانا، ٢٠١٨.

٤-شەوێك لەگەڵ خۆردا، د. عبدالکریم سروش، وەرگێڕان، ٢٠١٨.

## زنجیرەی سروش:

١- چییەتی مەرگ؟ د.عبدالکریم سروش، ئامادەکردن و وەرگێران، ساڵی ٢٠٠٩.

٢- عەقڵ و ئیمان.ن: د.عبدالکریم سروش. وەرگێران، چاپی دووەم، ساڵی ٢٠٠٩.

٣- سوننەت و مۆدێرنە، د.سروش، د.حسێن نەصر، نووسین و وەرگێڕان،٢٠١١.

٤- عەقڵ و عیشق، ن. د.عبدالکریم سروش، وەرگێڕان، ٢٠١٣.

٥- ئێمە لەکام جیهاندا دەژین؟ ن: د. عبدالکریم سروش. وەرگێران، ج٢، ٢٠١٩.

## زنجیرەی شەریعەتی:

١- مرۆڤ، ن. د. عەلی شەریعەتی، وەرگێڕان، چاپی چوارەم، ٢٠١٥.

٢-دەفتەرە خۆڵەمێشییەکان. د. عەلی شەریعەتی، وەرگێران، چاپی سێیەم، ٢٠١٥.

٣-نزا، د. عەلی شەریعەتی، وەرگێڕان، چاپی دووەم، ٢٠١٥.

٤-شەریعەتی، کێ بوو؟ چی گووت؟ ئامادەکردن و وەرگێڕان، چاپی یەکەم، ٢٠١٥.

٥-نیشتنەوە، د. عەلی شەریعەتی، وەرگێڕان، ٢٠١٥.

## زنجیرەی گفتوگۆکان:

١- پەنجەرە ناز، گفتوگۆ، ٢٠٢١.

٢- نیگای فەیلەسوفان، ئامادەکردن و وەرگێڕان، ٢٠٢١.

## زنجیرەی وتە:

١-سوکرات و ئەفلاتون، کۆمەڵە ووتە. چاپی دووەم، ساڵی ٢٠١١.

٢-وتەکانی عیشق، کۆمەڵە نووسەر، ئامادەکردن و وەرگێڕان، ٢٠١٣.

٣-ووتەکانی ژیان، ئامادەکردن و وەرگێڕان. چ ٢، ساڵی ٢٠١٣.

٤-وتەکانی (سوکرات، ئەفلاتون،ئەرستۆ)، (کوردی-ئینگلیزی))،ئا، وەرگێڕان، ٢٠١٤.

٥- گەوهەرەکانی ژیان، وتەی (کوردی - فارسی - ئینگلیزی))، ئا، وەرگێڕان، ٢٠١٥.

## ئەو بەرهەمانەی لەبەردەستدان و ئامادەی چاپن:

١- فەلسەفەی عەدالەت. ن: تەحسین حمەغریب، وەرگێڕان.

٢- راپۆرتێك بۆ خاکی یۆنان. ن: نیکۆس کازانتزاکیس، وەرگێڕان.

٣- ئایینەکانی چین و یابان. وەرگێڕان.

٤- عیشق و جوانی، کۆمەڵە نووسەر، وەرگێڕان.

٥- نەتەوەناسی، وتار و گفتوگۆ.

٦-سوهرەوەردی، رەخنە و شیکاری، ن. د. حسن ئەنساری. وەرگێڕان.

٧- گەورەتر لە ئایدۆلۆژیا، ن. د.عبدالکریم سروش، وەرگێڕان.

٨- رزگاری، هەڵبژاردەی وتەکانی مهاتماگاندی، وەرگێڕان.

٩- ئەخلاق و عەدالەت، کۆمەڵە نووسەر. ئامادەکردن و وەرگێڕان.

١٠- فیکری ناسکی غەمناك، د. سروش دەباغ، ئامادەکردن و وەرگێڕان.

١١-گیانی گیانان، ژیان و گوتەکانی مەولانای رۆمی، ئامادەکردن و وەرگێڕان.

١٢- ئەخلاقی دەسەڵات، ئەخلاقی عەدالەت، د. عبدالکریم سروش، وەرگێڕان.

بێجگە لە نووسین و ئامادەکردن و وەرگێڕانی چەندین بابەتی فیکری و فەلسەفی و ئەدەبی و لێکۆڵینەوە و گفتوگۆ لەساڵی (١٩٩٧)ەوە تاکو ئێستا بە بەردەوامی لە زمانەکانی (فارسی و عەرەبی) دەنوسێت لە گۆڤارەکانی "هەژان، چاوی هەژان، ئێراننناسی، ئەمریکاناسی، سەردەم، زانستی سەردەم، هەورامان، هێشتا، پەیامی ڕاستی، سۆسیۆلۆژیا، لڤین، ڕامان، تاوی کۆمەڵایەتی، کەوانە، شرام، کۆچ، نووسین، ئایندەسازی، پەنجەرە، ڕوون، سەرچاوە، ئاوین، ئایندەسازی، ڕێفار." هەروەها ڕۆژنامەکانی "خەبات، یەککگرتوو، کوردستان ڕاپۆرت، ئاوێنە، داهێنان، کوردستانی نوێ، چاودێر، ئاسۆ، کۆمەڵ، ئایندە، ژیانەوە، خورماڵ، نسێ، ئاژانس."

